# سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ

# و زیکرەکانی ڕۆژانەی

نوسینی :
د.عبد الله بن حمود الفريح

أ.د. خالد بن على المشيقح
پێشەکی بۆ نوسیوە

# سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

# و زیکرەکانی رۆژانەی

خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت :

((وە بەردەوام بەندەکەم لێم نزیک دەبێتەوە بە سوننەتەکان تاوەکو خۆشم دەوێت))


نوسینی :

**د.عبد الله بن حمود الفريح**

**أ.د. خالد بن علي المشيقح**

پێشەکی بۆ نوسیوە



الطبعة الأولى

**١٤٤٠هـ / ٢٠١٩م**





# پێرستی بابەتەکانی کتێبەکە



## پێشەکییەکان





## سوننەتە کات بۆ دیاریکراوەکان





# سوننەتەکان کە بە کات دیاری نەکراون

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله وحده والصلاة والسلام على من لا نبي بعده، وبعد:

فقد قرأت في هذا المؤلف للشيخ عبدالله بن حمود الفريح (المنح العلية في بيان السنن اليومية) فقد ألفيته مؤلفاً مفيداً اشتمل على استقصاء السنن اليومية الفعلية والقولية في الليل والنهار، المنفردة والتابعة لغيرها مما ثبت بالدليل فجزاه الله خيراً، ونفع بمؤلفه آمين، وبالله التوفيق.

كتبه

د/ خالد بن علي المشيقح

١٤٣٤/١١/٦هـ

## پێشەکی :

له لایەن زۆر بەڕێز دکتۆر/ خالد بن علی المشيقح

سوپاس و ستایش بۆ خوای تاک وتەنها و صەڵات و سەلام لەسەر ئەو کەسەی هیچ پێغەمبەرێک له پاش ئەو نییە ، وبعد :

ئەم کتێبەم خوێندەوە له نوسینی شەیخ : عبدالله بن حمود الفريح (المنح العليَة في بيان السنن اليومية) .

بینیم کتێبێکی بە سوودە هەستاوە بە باسکردنێکی تێروتەسەلی سوننەتەکانی رۆژانە ، ئەوانەی کردارین و ئەوانەی بە وتن ئەنجام دەدرێن له شەو و رۆژدا ، ئەوانەی بەتەنهان و ئەوانەی پاشکۆی جگە له خۆیەتی ، ئەوەی بە بەڵگەوە سەلمێنراون .

خوای گەورە جەزای خەیری بداتەوە و سوودی بۆ نوسەرکەش هەبێت و خوای گەورە تەوفیقمان بدات .

به پێنووسی / د.خالد بن علی المشيقح

ئوستاد و دکتۆر له زانکۆی القصيم

مامۆستا له حەرەمی مەککی و مەدەنی

## پێشەکی :

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوای کە فەرموویەتی ::{لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيراً}[الاحزاب:٢١]) واتە: بەڕاستی پەیامبەری خوا چاکترین نموونەی ڕێک و پێکی و سەرمەشقە بۆتان، بەتایبەتی بۆ ئەو کەسە ، کە بە تەمای خواو ڕۆژی دواییە یادی خواش زۆر دەکا) (تەفسیری هەموو ئایەتەکانی ئەم کتێبە لە تەفسیری (ڕامان)ەوە وەرگیراوە) شوێنکەوتنی سوننەتەکانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لە شەرعدا دارشتووە ، وە صەڵات و سەلام لەسەر چاکترین کەس کە ڕێنمووی ئوممەتەکەی کردووە بۆ گوێڕایەڵییەکی تەواو و شوێنکەوتنی سوننەت ، وبعد :

برای خوێنەر ئەوەی لەبەر دەستت دایە، سوننەتی ڕۆژانەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) لەو کاتەوە لە خەو هەڵدەستێت تاوەکو کاتی خەوتنی ، ڕێکخراوە بە پێی کاتەکان، ئەمجار لە پاش ئەوە چەند سوننەتێکی تری ڕۆژانەم باس کردووە کە بە کاتێکی دیاری کراو دیاری نەکراون ، وە مەبەستم لە سوننەتی موستەحەب ئەوەیە کە شەرع فەرمانی پێکردووە بەڵام لە ڕووی ئیلزامەوە نییە ، بەڵکو لە ڕووی کەمال و زیادەکردنی گوێڕایەڵییەکانە ، ئەمەش کورتکراوەی کتێبە ئەصڵەکەیە (المنح العَلِيَة فِي بيَانِ السُنَنِ اليَوْمِيَة) لە پاش ئەوەی مەسەلە زانستی و ئەو سوود بەدەست هاتووانەی کە پەیوەستن بە سوننەتەکانەوە لابراون ، وە تەنها ئەم کورتکراوەم هێشتەوە ئەویش هێنانەوەی سوننەتەکەیە لە گەڵ بەڵگەکەیدا، وەکو وەڵامدانەوەی پێشنیاری هەندێ لەو برایانە بۆ کورتکردنەوەی ، هەروەها لەبەر ئاسانکردنەوەیەک بۆ ئەو کەسانەی کاتەکەیان بەشیان ناکات یان کەم هەوڵ دەدەن بۆ خوێندنەوەی ئەصڵەکە ، هەروەها بۆ ئەوەی هەندێ لەو دەزگا خەیرخوازانەی کە خەریکی کاری بانگەوازن بۆ چاپکردنی و گەیاندنی بۆ زۆرترین

کەس بە پێی توانا ، وە ئەو پاڵنەرەی کە بووە هۆی بە دواداچوونی سوننەتەکانی رۆژانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەیە حەزکردن و ویستن لە دەرخستن و بڵاوکردنەوەی رێگا و رێبازەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو پێویست، ئەو رێبازەی رۆژهەڵات ناشرینی کردووە ، لە گەڵ ئەوەی کە لە واقیعی ئەمڕۆماندا دیار و ئاشکرایە لە کەمتەرخەمی لە دەست گرتن بە سوننەتەوە بە بیانووی ئەوەی ئەو کەسەی وازی لێ بهێنێ سزا نادرێت ، بۆیە خەیرێکی زۆرمان لە دەست دەرچووە، وە سوور بووم لەسەر ئەوەی کە سوننەتە صەحیحەکان بهێنمەوە ، وە تەنها ئەوانەی رۆژانەن و گرێمداون بە بەڵگەکانیەوە ، داوا لە خوای گەورە دەکەم بمانگێڕێ لەو کەسانەی کە شوێنی رێبازەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەون و شوێن پێی ئەو دەگرنە بەر و لە گەڵ گرووپ و تاقمەکەی خۆیدا حەشرمان بکات .

بە پێنوسی / د.عبد الله بن حمود الفريح

بۆ پەیوەندیکردن لە رێگای پۆستی ئەلیکترۆنییەوە :

forih@hotmail.com



## دەستپێک.



### مانای سوننەت :

**سوننەت بە مانای موستەحەب و مەندوب دێت .**

**جا سوننەت : بریتییە لەوەی شەرع فەرمانی پێکردووە بەڵام لە رووی ئیلزامەوە نییە ، وە بەرهەمەکەی : بکەرەکەی پاداشت وەردەگرێت و ئەوەی وازی لێ دەهێنێ سزا نادرێت .**

### چەند نمونەیەک لەسەر سووربوونی سەلەف لەسەر سوننەت :

1. ئیمامی (موسلیم) لە صەحیحەکەیدا ریوایەتی کردووە لە فەرموودەی (النعمان بن سالم) لە (عمرو بن أوس)ەوە -رەزای خوایان لەسەر بێت – دەڵێت : (عنبسة بن أبي سفيان) بۆی گێڕامەوە، وتی : گوێم لێ بوو (أم حبيبة) دەیفەرموو : گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : (هەرکەسێ لە شەو رۆژێکدا دوازدە رکات نوێژی کرد ، ئەوا بەهۆیەوە لە بەهەشتدا خانوویەکی بۆ دروست دەکرێت) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە(١٧٢٧) (أم حبيبة) دەفەرموێت :

(لەو کاتەوە گوێم لەم فەرموودەیە بووە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) هەرگیز وازم لێ نەهێناوە) وە (عنبسة) دەڵێت : (لەو کاتەوە گوێم لەم فەرموودەیە بووە لە (أم حبيبة)وە هەرگیز وازم لێ نەهێناوە).

وە (عمرو بن أوس) دەڵێت : لەو کاتەوە گوێم لەم فەرموودەیە بووە لە (عنبسة)وە هەرگیز وازم لێ نەهێناوە.

وە (النعمان بن سالم) دەڵێت : لەو کاتەوە گوێم لەم فەرموودەیە بووە لە (عمرو بن أوس)ەوە هەرگیز وازم لێ نەهێناوە.

٢ فەرموودەکەی (عەلی) -رەزای خوای لێ بێت- :

کەوا –فاطمە- شکایەتی حاڵی خۆی کرد بە هۆی دەساڕەوە کە تووشی دەستەکانی دەبێت، چەند کەنیزەکێکیان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێنا بوو ، ئەویش چوو بۆ لای باوکی کەچی نەیبینی ، بە عائیشە گەیشت و هەواڵەکەی پێ گوت ، کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕایەوە ، عائیشە هەواڵی پێدا بە هاتنی (فاطمە) بۆ لای ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ لامان ، لە کاتێکدا ئێمە چووبوینە ناو جێگەی خۆمانەوە ، ویستمان هەڵسین ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : لە جێگای خۆتان بمێننەوە ، ئەمجار لە نێوانماندا دانیشت تاکو هەستم بە ساردی پێی کرد لەسەر سینگم ، ئەمجار فەرمووی: ئایە شتێکتان فێر بکەم باشتر بێت لەوەی داواتان کردبوو؟ ئەگەر چوونە سەر جێگاکەتان ئەوا سی و چوار جار بڵێن (الله اکبر) وسی و سێ جار بڵێن (سبحان الله)سی و سێ جار بڵێن (الحمد لله) ، جا ئەوە باشترە بۆتان لە خزمەتکار) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٧٠٥) و (موسلیم) بە ژمارە (٢٧٢٧) .

وە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە: عەلی –رەزای خوای لێ بێت- دەفەرموێت : لەو کاتەوە لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە وازم لێ نەهێناوە ، پێیان وت : تەنانەت شەوی (صفين)ش ؟ فەرمووی : تەنانەت شەوی (صفين)ش) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٣٦٢) و (موسلیم) بە ژمارە (٢٧٢٧) .

ئاشکراشە شەوی (صفين) ئەو شەوەیە کە جەنگەکەی تێدا روویدا ، وە عەلی سەرکردە بوو تیایدا ، لە گەڵ ئەوەشدا سەرقاڵی نەکرد لە ئەنجامدانی ئەم سوننەتە .

٣ ئیبن عومەر – رەزای خوای لەسەر بێت- نوێژی جەنازەی دەکرد و ئەمجار دەڕۆیشت و شوێنی نەدەکەوت ، گومانی وابوو کە ئەمە سوننەتە کامل و تەواوەکەیە ، وە ئەو فەرموودەی کە هاتووە دەربارەی فەزڵی شوێنکەوتنی جەنازە تاوەکو دەنێژرێت پێی نەگەیشتبوو ، کاتێ فەرموودەکەی (أبو هريرة)ی پێ گەیشت – رەزای خوای لێ بێت- ، پەشیمان بوویەوە لەسەر لە دەستدانی سوننەت ، جوان ورد بەرەوە چی کرد ؟

چەند بەردێک بە دەستیەوە بوو دای بە زەوییدا و ئەمجار گوتی : بە راستی کەمتەرخەم بوین لە چەندەها قیرات) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٣٢٤) وە (موسلیم) بە ژمارە (٩٤٥) .

ئیمامی نەوەوی – رەحمەتی خوای لێ بێت - دەفەرموێت : ئەمەش بەڵگەیە لەسەر سوور بوون و حەزی هاوەڵان لەسەر گوێڕایەڵییەکان کاتێ پێیان دەگات ، وە خەمخواردنیان لەسەر ئەوەی لە دەستیان دەرچووە هەرچەندە گەورەیی پێگەکەیان نەزانیبێت) . تەماشای (المنهاج ١٥/٧) بکە .

## لەبەرهەمەکانی شوێنکەوتنی سوننەت:

## برای خۆشەویستم .. شوێنکەوتنی سوننەت چەندین بەرهەمی هەیە ، لەوانە :

١ گەیشتن بە پلەی خۆشەویستی ، جا بە خۆ نزیککردنەوە لە خوای گەورە بە سوننەتەکان (نافیلەکان) بەندە خۆشەویستی خوای گەورە بە دەست دەهێنێ ..

إبن القیم – رەحمەتی خوای لێ بێت – دەفەرموێت : خوای گەورە هەرگیز تۆی خۆش ناوێ ئیللا مەگەر شوێنی خۆشەویستەکەی بکەویت بەئاشکراو نهێنی ، جا ئەگەر باوەڕت بە هەواڵەکانی کرد و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بویت و وەڵامی بانگەوازەکەیت دایەوە و بە خوایشتی خۆت پێش هەموو شتێکت خست و حوکمی ئەوت پێش حوکمی جگە لە ئەو خست و خۆشەویستی ئەوت پێش خۆشەویستی دروستکراوەکان خست و گوێڕایەڵی ئەوت پێش گوێڕایەڵی جگە لە ئەو خست ، وە ئەگەر وا نەبوو ئەوا خۆت ماندوو مەکە و بگەڕێوە لە هەر کوێوە ویستت لێیەتی و بە دوای روناکییەکدا بگەڕێ چونکە تۆ لەسەر هیچ شتێک نیت)) تەماشای (مدارج السالکین ٣٧/٣) بکە .

٢ بە دەست هێنانی لەگەڵبوونی خوای گەورە بۆ بەندە ، بۆیە خوای گەورە تەوفیقی دەدات بۆ چاکە ، بۆیە هیچ شتێک لە ئەندامەکانییەوە دەرناچێت ئیللا ئەوەی خوای گەورە پێی رازییە ، چونکە ئەگەر خۆشەویستی بە دەست هێنا ئەوا لە گەڵبوونیش بە دەست دەهێنێ ..

٣ وڵامدانەوەی دوعاکان کە بە دەستهێنانی خۆشەویستی لە خۆ دەگرێت ، جا هەرکەسێ خۆی نزیک کردەوە بە سوننەتەکان ئەوا خۆشەویستی بە دەست دەهێنێ و هەرکەسێ خۆشەویستی بە دەست هێنا ئەوا وەڵامی دوعاکان بە دەست دەهێنێ ..

## وە بەڵگەش لەسەر ئەم سێ بەرهەمە :

فەرمووەدەکەی (أبو هريرة)یە – رەزای خوای لێ بێت – دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (خوای گەورە فەرموویەتی : هەرکەسێ دژایەتی خۆشەویستێکی من (وەلییەکی من) بکات ئەوا بریاری جەنگی لە گەڵدا دەدەم ، وە هیچ بەندەیەک لێم نزیک نەبووەتەوە بە شتێک پێم خۆش بێت وەکو ئەوەی فەرزم کردووە لە سەری ، وە بەردەوام بەندەکەم بە ئەنجامدانی سوننەتەکان لێم نزیک دەبێتەوە تاوەکو خۆشم دەوێت ، جا ئەگەر خۆشم ویست ئەوا دەبمە ئەو بیستنەی پێی دەبیسێ و ئەو بینینەی پێی دەبینێ و ئەو دەستەی کە کاری پێ دەکات ، وە ئەو پێیەی رێی پێ دەکات ، ئەو کات ئەگەر

داوام لێ بکات پێی دەبەخشم و ئەگەر پەنام پێ بگرێت پەنای دەدەم ، وە لە هیچ شتێکدا موتەرەدید نەبوومە لە ئەنجامدانی وەکو تەرەددودم لە نەفسی کەسێکی ئیماندار پێی ناخۆشە بمرێت و منیش پێم ناخۆشە ئازاری بدەم) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٥٠٢) ..

٤ پڕکردنەوەی ئەو کەلێن و کەموکورتیانەی لە فەرزەکاندا روویانداوە ، جا سوننەتەکان ئەو کەلێنانە پڕ دەکەنەوە کە لە فەرزەکاندا روویان داوە لە هەر خەوش و خەلەلێک ..

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (ئەبو هریرە)یە - رەزای خوای لێ بێت - دەفەرموێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : (یەکەم شتێک بەندەکان لێپرسینەوەیان لە سەر بکرێت لە رۆژی قیامەتدا لە کردەوەکانی ئەوا نوێژە ، جا ئەگەر باش و رێک وپێک بوو ئەوا دەربازی دەبێت و سەرکەوتوو دەبێت ، بەڵام ئەگەر خراپ بوو ئەوا پەشیمان دەبێتەوە و خەسارەتمەند دەبێت، وە ئەگەر لە فەرزەکانی هەر کەموکورتییەک هەبوو ، ئەوا خوای پەروەردگار دەفەرموێت : تەماشای نوێژی عەبدەکەم بکەن بزانە نوێژی سوننەتی تیادایە (تطوع) ؟ جا ئەو نوێژە فەرزانەی کەموکورتی تێدا بووە لە سوننەتەکان بۆی پڕ دەکرێتەوە ، ئەمجار هەموو کردەوەکانی لەسەر ئەوە بنیات دەنرێت) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٩٤٩٤) و ئەبوداود بە ژمارە (٨٦٤) و الترمذي بە ژمارە (٤١٣) و البانی بە (صحیح) ی داناوە (صحیح الجامع ٤٠٥/١)



# سوننەتە کات بۆ دیاریکراوەکان

مەبەست لە سوننەتە کات بۆ دیاریکراوەکان : ئەو سوننەتانەن بە کاتێکی دیاری کراو لە شەو و رۆژدا کاتیان بۆ دیاری کراوە ، جا ئەوانە چەند سوننەتێکن لە کاتی دیاری کراودا سوننەتن بکرێن ، وە منیش دابەشم کردووە بە حەوت کاتەوە : پێش فەجر ، وە کاتی فەجر ، وە کاتی چێشتەنگاو ، وە کاتی نیوەڕۆ و کاتی عەسر و کاتی مەغریب و کاتی خەوتنان .





## یەکەم : کاتی پێش فەجر .



ئەمەش یەکەم کاتە بە پێی هەستان لە خەو ، وە دەکرێت سوننەتەکان لەم کاتەدا بکرێن بە دوو بەشەوە :

**بەشی یەکەم :** هەستان لە خەو و ئەوەی بە دوایدا دێت لە کردارەکان کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنجامی دەدا :

### ١ دەمی بە سیواک پاک دەکردەوە، واتە : سیواکی پێدا دەهێنا .

لە (حذیفة)ەوە – ڕەزای خوای لەسەر بێت - ریوایەت کراوە و فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر شەوان لە خەو هەستایە ئەوا دەمی بە سیواک پاک دەکردەوە ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٤٥) و (موسلیم) بە ژمارە (٢٥٥) وە لە ریوایەتەکەی (موسلیم) دا هاتووە : پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر هەستایە بۆ شەو نوێژ ئەوا دەمی بە سیواک پاک دەکردەوە) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٥٥) . وە (الشوص) واتە : سیواکی بە دەمدا دەهێنا بە شێوەی پانی .



## ٢ ئەو زیکرانە دەخوێنێ کە لە کاتی هەستان لە خەودا هاتووە .

ئەویش ئەوەیە کە لە (صحیح البخاری)دا هاتووە لە فەرموودەی (حذیفة)ەوە -ڕەزای خوای لێ بێت - دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر بیویستایە بخەوتایە دەیفەرموو : (ئەی خودایە.. بە ناوی تۆوە دەمرم و دەژیم). وە ئەگەر لە خەو هەستایە دەیفەرموو: (سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوای کە زیندووی کردینەوە لە پاش ئەوەی مراندنی (واتە : خەوتن) و زیندووبونەوەش هەر بۆ لای ئەوە) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٣٢٤) و (موسلیم) لە فەرموودەی (البراء)ەوە - ڕەزای خوای لەسەر بێت - بە ژمارە (٢٧١١) .

## ٣ خەوەکە لە دەموچاوی دەسڕێت ..

## ٤ تەماشای ئاسمان دەکات ..

## ٥ دە ئایەتەکەی کۆتایی سورەتی (آل عمران) دەخوێنێت .

وە ئەم سێ سوننەتە لە فەرموودەکەی (إبن عباس)ەوە هاتوون : شەوێکیان لای میمونەی خێزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مایەوە -کە پورییەتی- ، لە سەر پانی سەرینەکە راکشام و پێغەمبەری خواو (ﷺ) خێزانەکەی لەسەر درێژییەکەی راکشان ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەوی لێکەوت تاوەکو نیوەی شەو یان کەمێ پێش نیوە شەو یان کەمێک پاشی بوو ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستاو خەوی دەموچاوی بە دەستەکانی سڕی ، ئەمجار دە ئایەتی کۆتایی سورەتی (آل عمران)ی خوێندەوە ، ئەمجار هەستا بۆ کوونەیەکی هەڵواسراوو دەستنوێژێکی جوانی لێگرت و ئەمجار هەستا و دەستی بە نوێژ کرد ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٨٣) و (موسلیم) بە ژمارە (٧٦٣) .

وە لە ریوایەتێکی تردا کە لە (مسلم)دا هاتووە بە ژمارە (٢٥٦) : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کۆتایی شەودا هەستاو ئەمجار دەرچوو و تەماشای ئاسمانی کرد و ئەمجار ئەم ئایەتەی خوێندەوە لە (آل عمران) : ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾(آل عمران١٩) واتە : بەڕاستی لەوشێوە دروستکردنە سەرسوڕهێنەرەی ئاسمانەکان و زەویی و ئاڵوگۆڕی شەوو ڕۆژ، چەندین بەڵگەو نیشانەی پتەو هەیە لەسەر بوونی خواو، تاک و تەنیایی بۆ کەسانێ خاوەنی ژیرین و هۆشمەندن)





(یَمْسَحُ النَوْمَ عَنْ وَجْههِ بِیَدِهِ) واتە : چاوەکانی بە دەستی دەسڕێت ، بۆ ئەوەی شوێنەواری خەوتن بسڕێت ، وە (الشَنُ) واتە : کونە ..

وە لە ریوایەتەکەی (موسلیم)دا روونکردنەوەی ئەوەی تێدایە بۆ هەرکەسێک بیەوێت ئەم سوننەتە جێ بە جێ بکات ، ئەوا بەو ئایەتە دەست پێ دەکات :﴿ إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ تاوەکو کۆتایی (آل عمران) .

## ٦ هەردوو دەستی سێ جار دەشوات .

بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی لە (أبو هریرة)ەوە هاتووە – رەزای خوای لێ بێت – کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ئەگەر یەکێکتان لە خەو هەستا ، ئەوا با دەستی یەکسەر نەخاتە ناو دەفرەکەوە تاوەکو سێ جار دەیشۆرێت ، چونکە ئەو نازانێت دەستەکانی لە کوێدا بوون) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٦٢) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٧٨) ..

## ٧ ئاو وەردەداتە لوتی ودەریدەهێنێ سێ جار .

بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی (أبو هریرة) ریوایەتی کـردووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ئەگەر یەکێکتان لە خەو هەستا ئەوا با سێ جار ئاو وەرداتە لوتی ، چونکە شەیتان لە لوتیدا دەمێنێتەوە) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٢٩٥) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٣٨) . وە لە ریوایەتەکەی (بوخاری)دا هاتووە : (ئەگەر یەکێکتان لە خەو هەستا و دەستنوێژی شوشت ئەوا با سێ جار ئاو وەرداتە لوتی ...) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٢٩٥) .

## ٨ ئەمجار دەست نوێژ دەشۆرێت.

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (إبن عباس) – رەزای خوای لێ بێت- کە لە پێشدا باسکرا کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی نوێژ بکات ، هەستا بۆ لای کونە هەڵواسراوەکە و دەستنوێژی لێ شوشت

وە لە دەستنوێژدا ، کەمێک رادەوستین و چەند سوننەتێکی دەستنوێژ روون دەکەینەوە لە رووی کورتی و ژمارەوە ، نەک بە درێژ و حەصرەوە چونکە ئاشکرا و زانراوە ، وە بۆیە باسی دەکەین لەبەر تەواوکردنی باسکردنی سوننەتەکان.

# جا لە سوننەتەکانی دەستنوێژ



## ١ سیواک :



ئەویش پێش ئەوەی دەست بە دەستنوێژ شوشتن بکات ، یان پێش ئەوەی ئاو لە دەمی وەردات ، ئەمەش جێگای دووەمە کە سوننەتە سیواکی تێدا بەکار بهێنرێت – لە پێشدا باسی جێگای یەکەم کرا- بۆیە سوننەتە بۆ هەر کەسێک بیەوێ دەستنوێژ بشۆرێت ئەوا سیواک بکات ، بەبەڵگەی فەرموودەکەی (أبو هريرة) کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ( ئەگەر مەشەقەت نەبوایە لەسەر ئوممەتەکەم ئەوا فەرمانم پێ دەکردن بە سیواک کردن لەگەڵ هەموو دەستنوێژێکدا ) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٩٩٢٨) و إبن خزيمە و بە صەحیحی داناوە (١٤٠/٧٣/١) و الحاكم (٢٤٥/١) وە (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە تەعلیقی و بە شێوازی جەزم لە بەشی : (سواک الرطب واليابس للصائم)

وە بە بەڵگەی فەرموودەکەی دایکە عائیشە – ڕەزای خوای لێ بێت – دەفەرموێت : ئێمە سیواک و ئاوی دەستنوێژەکەیمان بۆ ئامادە دەکرد ، ئەمجار بە فەرمانی خوای گەورە لە خەو هەڵدەستا لەو کاتەی ویستی خوای لێ بوایە هەستێت ، جا سیواکی دەکرد و دەستنوێژی دەشوشت و نوێژی دەکرد ...) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٤٦)

## ٢ وتنی : بسم الله:

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو هريرة) -ڕەزای خوای لێ بێت- بە (مرفوع)ی هاتووە: دەستنوێژی نییە ئەو کەسەی لە سەر دەست نوێژەکەی ناوی خوا نەهێنێ ). ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (١١٣٧١) و أبوداود بە ژمارە (١٠١) وابن ماجه بە ژمارە (٣٩٧) ..

## ٣ شووشتنی دەستەکان سێ جار .



بە بەڵگەی فەرموودەکەی (عوسمان) -ڕەزای خوایّ لێ بێت- دەربارەی شێوازی دەستنوێژەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و تێیدا هاتووە : داوای ئاوی دەستنوێژی کرد و دەستنوێژی شوشت ، سەرەتا هەردوو دەستی شوشت ...) ئەمجار فەرمووی : (پێغەمبەری خوام (ﷺ) دەبینی ئا بەم شێوەیەی من دەستنوێژی دەشوشت ) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (١٦٤) و (موسلیم) بە ژمارە (٢٢٦) .

## ٤ دەست پێکردن بە لای ڕاست لە شوشتنی دەستەکان و پێیەکاندا.



بە بەڵگەی فەرموودەکەی (دایکە عائیشە) -ڕەزای خوای لێ بێت- دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستپێکردن بە لای ڕاستی پێ خۆش بوو لە پێڵاو لە پێکردنی (نەعل لە پێکردنی) و سەرشانەکردنی و دەستنوێژ شوشتنی و هەموو کاروبارێکیدا) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (١٦٨) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٦٨) .

### ٥ دەست پێكردن بە ئاو وەردانە دەم و ئاو هەڵدانە لوت .

بە بەڵگەی فەرموودەكەی (عوسمان) -رەزای خوایٚ لێ بێت- دەربارەی شێوازی دەستنوێژەكەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و تێیدا هاتووە : ئاوی وەردایە دەمی و لوتی ، ئەمجار دەموچاوی سێجار شوشت ..) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (١٩٩) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٢٦) . ئەگەر ئاو وەردانە دەم و لوتی دوا بخات بۆ دوای شوشتنی دەموچاوی ئەوا دروستە .



### ٦ زیـادەڕەوی كردن لە ئاو وەردانـە دەم و لوت بۆ كەسێک بە رۆژوو نەبێت .

بە بەڵگەی فەرموودەكەی (لقيط بن صبرة) -رەزای خوای لێ بێت- كەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرمووە : دەستنوێژێكی جوان بشۆ (واتە : هەموو سونەتەكانی تێدا كرابێـت) وە نێوان پەنجەكانیش بشۆ وە زیادەڕەوی بكە لە ئاو وەردانە لوت ئیللا مەگەر بە رۆژوو بیت) ئەحمەد ریوایەتی كردووە بە ژمارە (١٧٨٤٦) و أبو داود بە ژمارە (١٤٢) و إبن حجر فەرموویەتی : (ئەم فەرموودەیە (صحيح) ە ) الأصابة (١٥/٩) وە بەڵگەی زیادەڕەوی لە ئاو وەردانە دەمدا لەو دەستەواژەیەوە وەرگیراوە: (اسْبِغ الوُضُوء).



### ٧ ئاو وەردانە دەم و لوت بە یەک دەست.

بە بەڵگەی فەرموودەكەی (عبدالله بن زيد) -رەزای خوایٚ لێ بێت- دەربارەی شێوازی دەستنوێژەكەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، دەفەرموێت : (... دەستی خستە ناو –دەفرەكەوە – ئەمجار دەریهێنا و ئاوی وەردایە دەم و لوتی بە یەک دەست (گوێل) ئەو كارەی سێ بارە كـردەوە) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (١٩٢) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٣٥) .

## ٨ لە سڕینی سەردا سوننەتە بەو شێوازە بکرێت لە سوننەتدا هاتووە .



ئەویش دەست دەکات بە سڕینی سەری ، هەردوو دەستی دەخاتە سەر پێشەوەی سەری ئەمجار بەرەو پاشەوە دەیبات تاکۆتایی سەری ئەمجار جارێکی تر دەهێنێتەوە ئەو جێگەیەی کە لەوێوە دەستی پێ کردبوو ، و ئافرەتیش هەروەها ئەم سوننەتە جێ بە جێ دەکات بە هەمان شێواز ، وە ئەو پرچەی لە گەردنی ئافرەت زیاترە ئەوا مەسحی لەسەر ناکات .

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (عبدالله بن زید) -رەزای خوای لێ بێت- دەربارەی شێوازی دەستنوێژەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، تیایدا هاتووە : لە پێشەوەی سەری دەستی پێدەکرد ئەمجار دەستەکانی بۆ پشتەوەی سەری برد ، ئەمجار گەڕانییەوە تاوەکو ئەو جێگایەی لەوێوە دەستی پێکردبوو ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٨٥) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٣٥) .

## ٩ شوشتنی هەر ئەندامێک سێ جار.

شوشتنی یەکەم واجیبە ، وە دووەم و سێیەم سوننەتە ، وە لە سێ جار زیاتر ناکرێت.

بەڵگەش لەسەر ئەوە : ئەوەی لای (بوخاری) – رەحمەتی خوای لێ بێت - بە سابتی هاتووە لە فەرمووودەی (ابن عباس) – رەزای خوای لێ بێت - : پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستنوێژی شوشت یەکجار یەکجار ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٥٧) ، هەروەها لای (بوخاری) سابت بووە لە فەرموودەی (عبدالله بن زید) –رەزای خوای لێ بێت- کەوا ( پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستنوێژی شوشت دووجار دووجار ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٥٨) وە لە هەردوو کتێبی (صحیح) دا هاتووە لە فەرموودەی عوسمان –رەزای خوای لێ بێت – کەوا ( پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستنوێژی شوشت سێجار سێجار ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٥٩) ، بۆیە باشتر وایە جۆراوجۆر ئەنجام بدرێت ، هەندێ جار دەستنوێژ بشۆرێت یەکجار یەکجار وە هەندێ جار دووجار دووجار ، وە هەندێ جار سێجار سێجار ، وە هەندێ جار جیاوازی بکات لە ژمارەکاندا ، بۆ نمونە دەموچاوی سێجار بشۆرێت و هەردوو دەستی دووجار وە هەردوو پێی یەکجار ، هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)دا هاتووە لە فەرموودەی (عبدالله بن زید) –رەزای خوای لێ بێت – لە ریوایەتێکی تردا ، تەماشای : زاد المعاد بکە (١٩٢/١) بەڵام زۆر جار باشترە تەواوەکە ئەنجام بدات واتە سێجار سێجار ، ئەمەش رێبازەکەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

## ١٠ ئەو دوعایەی لە پاش دەستنوێژ هاتووە .

لە عومەرەوە هاتووە دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی : هەر یەکێک لە ئێوە دەستنوێژ بشۆرێت - بە باشی و بە تەواوی دەستنوێژەکەی بشۆرێت - ئینجا بڵێت : (أشهد أن لا اله الا الله و اشهد أن محمدا عبده و رسوله ) ئەوا هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە ، لە کامیانەوە بیەوێت دەچێتە ژوورەوە) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٣٢) .

یان : ئەوەی لە فەرموودەکەی (أبوسعید)دا هاتووە بە (مرفوع)ی : (ئەگەر کەسێک دەستنوێژی شوشت و لە دەستنوێژەکەی بویەوە و وتی : ( ئەی خوایە ..پاکی و بێگەردی و سوپاس بۆ تۆیە ، شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆ نەبێت ، داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ) ئەوا خوای گەورە مۆرێک دەدا بەسەریدا (طابع : دەکرێت پیتی (باء)ەکە فەتحە و بێت و دەکرێت کەسرە بێت هەردوو زمانی پاراون ، ئەویش بریتیە لە مۆر ، وەمانای : (طَبَع) واتە : مۆری کرد ) ئەمجار بەرز دەکرێتەوە بۆ ژێر عەرش و تاکو رۆژی قیامەت ناشکێت) نەسائی ریوایەتی کردووە لە (عمل الیوم واللیلة) (ص٧٤١) و الحاکم (٧٥٢/١) وە إبن حجر سەنەدەکەی بە (صحیح) داناوە ، تەماشای (نتائج الأفکار) بکە (٢٤٦/١) ئەوەشی روون کردووەتەوە کە بە (مرفوع)ی نەهاتووە بەڵکو (موقوف)ە ، ئەوەش زەرەری نییە ، چونکە حوکمی (رفع)ی هەیە ، چونکە ئەوە بواری را و بۆچوونی تێدا نییە .









بەشی دووەم : هەستان بۆ شەو نوێژ و ویتر ، چەند کردارێکی تێدایە کە لە ڕێبازەکەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

١ سوننەتە شەونوێژ لە کاتە باشترەکەی خۆیدا بکرێت.:

ئەگەر وترا : باشترین کات کەیە بۆ شەو نوێژ؟

لە وەڵامدا دەڵێین : ئاشکرایە کەوا کاتی نوێژی ویتر لە پاش نوێژی خەوتنانەوە دەست پێ دەکات تاوەکو دەرکەوتنی فەجر ، جا کاتی نوێژی ویتر لە نێوان نوێژی خەوتنان و فەجردایە .

بەڵگەش لەسەر ئەوە :

فەرموودەکەی دایکە عائیشە –ڕەزای خوای لەسەر بێت- دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پاش ئەوەی لە نوێژی خەوتنان دەبویەوە تاوەکو نوێژ فەجر یازدە رکات نوێژی دەکرد ، لە نێوان هەر دوو رکاتدا سەلامی دەدایەوە یەک رکات ویتری دەکرد) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٠٣١) و (موسلیم) بە ژمارە (٧٣٦) .

◆ بەڵام دەربارەی باشترین کات بۆ شەو نوێژ بریتییە لە : سێ یەکی شەو لە پاش نیوەی .

مەبەست : کەسی موسڵمان شەو دەکاتە چەند بەشێکەوە ، لە نیوەی دووەمی شەودا هەڵدەستێ، وە لە کۆتایی شەودا دەخەوێت ، واتە : لە (چوارەم و پێنجەم) شەش یەکیدا هەڵدەستێت و لە (شەشەم) شەش یەکیدا دەخەوێت .

بەڵگەش لە سەر ئەمە : فەرموودەکەی (عبدالله بن عمرو) – رەزای خوای لەسەر بێت – دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : خۆشەویسترین رۆژوو لای خوای گەورە رۆژووی (داوود)ە ، وە خۆشەویسترین نوێژ لای خوای گەورە نوێژی (داوود)ە ، تا نیوەی شەو دەخەوت ، ئەمجار سێیەکی هەڵدەستا و شەش یەکی دەخەوت ، وە رۆژێک بە رۆژوو دەبوو و رۆژێکی نەدەگرت ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٤٢٠) و(موسلیم) بە ژمارە (١١٥٩)

◆ ئەگەر کەسێک ویستی ئەم سوننەتە جێ بە جێ بکات ، ئەوا چۆن شەو دەژمێرێت ؟

کاتەکە دەژمێرێت لە رۆژ ئاوابوونەوە تاوەکو دەرکەوتنی فەجر ، ئەمجار دابەشی دەکاتە شەش بەشەوە ، سێ بەشەکەی یەکەم نیوەی یەکەمی شەوە ، لە پاش ئەوە هەڵدەستێت ، واتە : لە (چوارەم و پێنجەم) شەش یەکیدا هەڵدەستێ ، چونکە ئەمە دەکاتە سێ یەک ، ئەمجار لە کۆتا شەش یەکیدا دەخەوێت ، ئەویش (شەشەم) شەش یەکیەتی ، بۆیە دایکە عائیشە فەرموویەتی : هیچ کاتێک سەحەری بەسەردا نەهاتووە –واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) - ئیللا لای من خەوتبوو ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١١٣٣) و(موسلیم) بە ژمارە (٧٤٢) .

ئا بەم شێوەیە کەسی موسڵمان ها لە باشترین کاتی شەو نوێژدا ، هەر وەکو لە فەرموودەکەی (عبدالله بن عمرو) ی– رەزای خوایان لێ بێت- پێشوودا هاتووە .

◀ **کورتەی باسەکە :** باشترین کات بۆ شەونوێژ دەکرێتە سێ مەرتەبەوە :

**مەرتەبەی یەکەم :** نیوەی یەکەمی شەو بخەوێت ، ئەمجار سێ یەکی هەڵسێت ، ئەمجار کۆتا شەش یەکی بخەوێت – هەروەکو لە پێشدا باسکرا-

بەڵگەش لەسەر ئەوە: فەرموودەکەی (عبدالله بن عمرو) ە – رەزای خوایان لێ بێت- کە لە پێشدا باسکرا .

**مەرتەبەی دووەم :** لە کۆتا سێ یەکی شەودا هەڵسێت

بەڵگەش لەسەر ئەوە :

فەرموودەکەی (أبو هريرة) یە – رەزای خوای لێ بێت-، کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: هەموو شەوێک پەروەردگارمان –بەرزو پیرۆزبێت- دادەبزێتە ئاسمانی دونیا (دابەزینێک شایستەی خوای گەورە بێت) کاتێک سێیەکی کۆتایی شەو دەمێنێت ، دەڵێت : کێ لێم دەپاڕێتەوە وەڵامی





دەدەمەوە؟ كێ داوام لێ دەكات پێی ببەخشم ؟ كێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەكات لێی خۆش دەبم؟) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (١١٤٥) و(موسلیم) بە ژمارە (٧٥٨) ، هەروەها فەرموودەكەی (جابر) – رەزای خوای لێ بێت - كە لە پاشاندا دێت .

ئەگەر ترسا كەوا لە كۆتایی شەودا هەڵناسێت ئەوا با لە سەرەتاكەیەوە نوێژەكەی بكات ، یان لە هەر بەشێكی شەودا بۆی گونجا ، ئەمەش مەرتەبەی سێیەمە .

مەرتەبەی سێیەم : لەسەرەتای شەودا نوێژەكەی بكات ، یان لە هەر بەشێكی شەودا بۆی گونجا .

بەڵگەش لەسەر ئەوە :

فەرموودەكەی (جابر)ە – رەزای خوای لەسەر بێت – فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: هەركەسێ لەوە ترسا كە لە كۆتایی شەودا هەڵناسێت ئەوا بە لە سەرەتاكەیەوە ویترەكەی بكات وە هەركەسێ تەماحی ئەوەی بوو لە كۆتاییەكەیدا هەڵدەستێت ئەوا با لە كۆتاییەكەیدا هەڵسێت، چونكە نوێژەكەی لە كۆتایی شەودا فریشتەی رەحمەت ئامادەی دەبن ، ئەوەش باشترە ) (موسلیم) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٧٥٥).

هەروەها لە وەصێتەكەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ (أبوذر) ئەم باسە دەگرێتەوە (نەسائی ریوایەتی كردووە لە (السنن الكبرى) (٢٧٢١) وە الألبانی بە (صحیح)ی داناوە (الصحیحە ٢١٦٦) وە لە فەرموودەی (أبو درداء ) ەوە هاتووە ، ئەحمەد ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٢٧٤٨١) وە أبو داود بە ژمارە (١٤٣٣) وە الألباني بە (صحیح)ی داناوە (صحیح ابی داود ١٧٧/٥) وە لە فەرموودەی (أبو هریرة) وە ، (موسلیم) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٧٣٧) ، هەر یەكێك لەوان فەرموویەتی : (خۆشەویستەكەم بە سێ شت وەصێتی پێ كردووم) ئەمجار باسی ئەوەشی كردووە : (وە ویتر بكەم لە پێش ئەوەی بخەوم ) .

## ٢ سوننەت وایە كە یازدە ركات بكات .

ئەمەش تەواوترینە بە بەڵگەی فەرموودەكەی دایكە عائیشە –رەزای خوای لێ بێت- كەوا فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نە لە رەمەزان و نە لە جگە لە رەمەزان لە یازدە ركات زیاتری نەدەكرد) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (١١٤٧) و(موسلیم) بە ژمارە (٧٣٨) .

هەروەها لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) هاتووە كەوا سیازدە ركات نوێژی كردووە ، ئیمامی (موسلیم) لە صەحیحەكەیدا ریوایەتی كردووە لە فەرموودەی دایكە عائیشەوە –رەزای خوای لەسەر بێت-

ئەمەش لە بابەتی جۆراو جۆر كردنی ویترە ، جا زۆربەی جار پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە یازدە ركات ویتری دەكرد ، وە هەندێ جار سیازدە ركاتی دەكرد ، بەم شێوە دەتوانین لە نیوان ئەو فەرموودانەی هاتوون كۆبكەینەوە .

### ٣ سوننەت وایە شەونوێژ بە دوو رکاتی سووک دەست پێ بکات .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی دایکە عائیشە - رەزای خوای لەسەر بێت - دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر شەو هەستایە بە مەبەستی ئەنجامدانی شەونوێژ ، ئەوا بە دوو رکاتی سووک دەستی پێ دەکرد) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٦٧).

### ٤ سوننەتە ئەو دوعایانە بخوێنێت کە لە دەستپێکردنی شەو نوێژدا هاتوون ، لەوانە



أ ئەو فەرموودەیەی لە (صحيح مسلم)دا هاتووە لە دایکە عائیشەوە -رەزای خوای لەسەر بێت - دەڵێت: ئەگەر لە شـەودا هەستایە ئەوا نوێژەکانی بەم زیکرە دەست پێدەکرد : (ئەی خودایە .. پەروەردگاری جبریل و میکائیل و ئیسرافیل ، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانای پەنهان و ئاشکرا ، تەنها تۆ داوەری دەکەیت لە نێوان بەندەکانتدا لەو شتانەی کە جیاوازییان تێدا بوو ، رێنموییم بکە بۆ سەر ئەو رێگە راستەی کە ئەوان تێدا جیاواز بوون بە ئیزنی خۆت ، هەر خۆت رێنمویی ئەو کەسانە دەکەیت کە ویستت لە سەری بێت بۆ سەر رێگای راست) (موسلیم) ریوایەتی کردووە (٧٧٠) .

ب ئەوەی لە هەردوو کتێبی (صحيح)دا هاتووە لە فەرموودەی (ابن عباس)ەوە - رەزای خوای لەسەر بێت - دەفەرموێت : ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە شەودا هەستایە بۆ شەونوێژ ئەوا دەیفەرموو : (ئەی خودایە .. سوپاس و ستایش بۆ تۆیە ، تۆ نورو روناکی ئاسمانەکان و زەویت، سوپاس و ستایش بۆ تۆیە ، تۆ راگری ئاسمانەکان و زەویت ، سوپاس و ستایش بۆ تۆیە ، تۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویت و هەموو ئەو شتانەی لە ناویاندایە ، هەر تۆ راست و رەوای، بەڵێنەکانت راست و رەوان ، وە وتەکانت راست و رەوان ، وە گەیشتن بە تۆ راست و رەوایە، وە جەننەت راست و رەوایە و ئاگر راست و رەوایە و پێغەمبەران راست و رەوان و دوارۆژ راست و رەوایە ، ئەی خودایە .. خۆم تەسلیمی تۆ کردو ئیمانم بە تۆ هێناو پەنام گرت بە تۆو گەڕامەوە بۆ لای تۆو داوەری دەگێرمەوە بۆ لای تۆ ، بۆیە لە تاوانەکانم خۆشبە ئەوەی کە پێشم خستووە ئەوەی پاشم خستوەو ئەوەی کە شاردومەتەوەو ئەوەی ئاشکرام کردوە ، تۆ خودای منی ، هیچ خودایەک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆ نەبێت) (بوخاری) ریوایەتی کردوو بە ژمارە (٧٤٩٩) و (موسلیم) بە ژمارە (٧٦٨) .





**٥ سوننەت وایە راوەستانەکەی درێژ بکاتەوە ، هەروەها کڕنۆشەکەی و سوژدەکەی،** به شێوەیەک وای لێ بێت کەوا هەموو روکنە کردارییەکانی نوێژەکەی نزیک یەکتر بن .

**٦ ئەو سوننەتانە بە جێ بهێنێ کە لە خوێندنەوەکەیدا هاتوون ، لەوانە :**

أ لە سەر خۆیی و هێمنی بیخوێنێتەوە ، مەبەستی ئەوەیە پەلە پەل نەکات لە خوێندنەوەیدا

ب ئایەت ئایەت بە جودا بیخوێنێتەوە ، مەبەست لێی : دوو ئایەت نەگەیەنێتە یەکتر ، یان سێ ئایەت بە بێ ئەوەی بوەستێت ، بەڵکو لەسەر هەموو ئایەتێک بوەستێت .

ج ئەگەر بە ئایەتی تەسبیحدا تێپەڕی ئەوا (سبحان الله) بکات ، وە ئەگەر بە ئایەتی داواکاریدا تێپەڕی داوا بکات ، وە ئەگەر بە ئایەتی پەناگرتندا تێپەڕی پەنا بگرێت .

بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێشوو :

فەرموودەکەی (حذيفه) – رەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت : شەوێکیان لە گەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) نوێژم کرد ، بە سورەتی (البقرة) دەستی پێکرد ، لە دڵی خۆمدا وتم : لە ئایەتی سەد کرنۆش دەبات کەچی رۆیشت ، وتم : رکاتەکەی پێ تەواو دەکات ، کەچی رۆیشت : وتم : کرنۆشی پێ دەبات، ئەمجار دەستی کرد بە خوێندنەوەی (النساء) و خوێندییەوە ، ئەمجار دەستی کرد بە سورەتی (آل عمران) و خوێندییەوە ، بە لەسەر خۆیی و هێمنی دەیخوێندەوە ، ئەگەر بە ئایەتی تەسبیحدا تێپەڕیبا ئەوا (سبحان الله)ی دەکرد ، وە ئەگەر بە ئایەتی داواکاریدا تێپەڕیبا داوای دەکرد، وە ئەگەر بە ئایەتی پەناگرتندا تێپەڕیبا پەنای دەگرت ، ئەمجار کرنۆشی برد و فەرمووی : (سبحان ربى العظيم) جا کرنۆشەکەی نزیکی وەستانەکەی بوو ، ئەمجار وتی : (سمع الله لمن حمده) ئەمجار زۆر راوەستا، نزیکی کرنۆشەکەی بوو ، ئەمجار سوجدەی برد و وتی : (سبحان ربي الأعلى) جا سوجدەکەی نزیکی وەستانەکەی بوو ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٧٢) .

وە هەر بە بەڵگەی ئەوەی (أحمد) ریوایەتی کردووە لە (مسند)ەکەیدا ، لە فەرموودەی (أم سلمة) – رەزای خوای لەسەر بێت – کاتێ پرسیاری لێکرا دەربارەی خوێندنەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئایەت ئایەت دەیخوێندەوە :﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ ﴾ ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٦٥٨٣) ، (الدار قطنى) دەفەرموێت (١١٨) : سەنەدەکەی (صحيح)ە وهەموویان (ثقه)ن ، وە (النووى) بە صحيح ی داناوە (المجموع ٣٣٣/٣)



## ٧ سوننەت وایە لە کۆتایی هەر دوو رکاتدا سەلام بداتەوە ..

بەبەڵگەی فەرموودەکەی (إبن عمر) – رەزای خوایان لەسەر بێت – کە فەرموویەتی :کابرایەک هەستا و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەونوێژ چۆنە ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : شەونوێژ دوو دوو رکاتە ، ئەگەر لەوە ترسای بەیانیت بە سەردا بێت ئەوا یەک رکات ویتر بکە) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٩٩٠) و(موسلیم) بە ژمارە (٧٤٩) .

مەبەست لە : (مثنى مثنى) واتە : دوو رکات دوو رکات نوێژ دەکات ، لە هەر دوو رکاتدا سەلام دەداتەوە، وە چوار رکات ناگەیەنێت بە یەک .

## ٨ سوننەت وایە لە کۆتا سێ رکاتەکەیدا چەند سورەتێکی دیاری کراو هەن ئەوانە بخوێنێت .

لە رکاتی یەکەمدا : ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ دەخوێنێت ، وە لە دووەمدا ﴿قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَـٰفِرُونَ﴾ دەخوێنێت ، وە لە رکاتی سێیەمدا تەنها ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ دەخوێنێت .

بەڵگەش لەسەر ئەوە :

فەرموودەکەی (أبی بن کعب) – رەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ ﴿قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَـٰفِرُونَ﴾ ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ویتری دەکرد

أبوداود ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٤٢٣) و نەسائي بە ژمارە (١٧٣٣) و إبن ماجه بە ژمارە (١١٧١) و نەوەوی و الألبانی بە (صحیح) یان داناوە (الخلاصە ٥٥٦/١) و (صحیح النسائي) ١ / ٢٧٣ .

## ٩ لە سوننەتدا هاتووە کەوا هەندێ جار لە ویترەکەیدا قونوت بخوێنێت.

مەبەست لێی لێرەدا : پاڕانەوەیە ، ئەویش لە رکاتی سێیەمدا کە سورەتی (الاخلاص) ی تێدا دەخوێنێت .

وە قونوت لە نوێژی ویتردا سوننەتێکە هەندێ جار ئەنجامی داوە ، چونکە لەهەندێ لە هاوەڵانەوە سەلمێنراوە ، وە هەندێ جار وازی لێ هێناوە . وە ئەمەش هەڵبژاردەی شێخ الاسلام إبن تیمیە یە – رەحمەتی خوای لێ بێت - باشتر وایە وازهێنان لێی زۆرتر بێت لە ئەنجامدانی.







### مەسەلە : ئایە دەستەکانی بەرز دەکاتەوە لە قونوتی ویتردا ؟

رای راست و دروست : دەستەکانی بەرز دەکاتەوە ، ئەمەش قسەی جمهوری زانایانە – رەحمەتی خوایان لێ بێت- چونکە لە (ابن عمر)ەوە جێگر بووە ، هەروەکو بەیهەقی ریوایەتی کردووە و بە (صحیح)ی داناوە.

بەیهەقی –رەحمەتی خوای لێ بێت- دەفەرموێت: ژمارەیەک لە هاوەڵان – رەزای خوایان لەسەر بێت- لە قونوتدا دەستەکانیان بەرز دەکردەوە . (تەماشای : السنن الكبرى (٢١١/٢) بکە .

### مەسەلە : بە چی شتێک قونوتەکەی لەنوێژی ویتردا دەست پێ دەکات ؟

رای پەسەند ئەوەیە - والله أعلم- : بە حەمد و سەنای خوا دەست پێ دەکات و ئەمجار صەڵاوات دەداتە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمجار دەپاڕێتەوە ، چونکە ئەمە نزیکترە لە وەڵامدانەوە.

بەڵگەش لەسەر ئەوە :

فەرموودەکەی (فضالة بن عبيد) – رەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێی لێ بوو کابرایەک لە نوێژەکەیدا دوعای دەکرد کەچی صەڵاواتی لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەم کابرایە پەلەی کرد ، ئەمجار بانگی کرد و بە ئەو و جگە لە ئەوی گوت : ئەگەر یەکێکتان نوێژی کرد ئەوا با حەمد و سەنای خوا بکات ، ئەمجار صەڵاوات لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدات ، ئەمجار لە پاش ئەوە بە ویستی خۆی دوعا بکات ) (الترمذي) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٤٧٧) و دەڵێت : ئەم فەرموودەیە (حسن صحيح)ە.

ابن القيم – رەحمەتی خوای لێ بێت - دەفەرموێت : موستەحەببە لە دوعادا ئەو کەسەی دوعاکە دەکات پێش داواکارییەکەی بە حەمد و سەنای خوای گەورە دەست پێ بکات، ئەمجار داوای پێداویستییەکەی بکات هەروەکو لە فەرموودەکەی (فضالة بن عبيد)دا هاتووە (تەماشای الوابل الصيب (ص١١٠) بکە .

### مەسەلە : ئایە لە پاش قونوت دەموچاوی بە دەستەکانی دەسڕێت ؟

رای راست و دروست ئەوەیە : سوننەت نییە دەموچاوی بسڕێت لە پاش کۆتایی دوعاکەی ، چونکە هیچ بەڵگەیەک لەسەری نەهاتووە .

پرسیار کرا لە ئیمامی مالک – رەحمەتی خوای لێ بێت- کەسێک بە دەستەکانی دەموچاوی دەسڕێت لە پاش دوعا ، ئەویش ئینکاری لێ کرد و فەرمووی : (نەمزانیوە هیچ بەڵگەیەک هەبێت) تەماشای : (كتاب الوتر للمروزي) بکە (ص٢٣٦).

شيخ الاسلام – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەفەرموێت : مەسحی دەموچاو بە دەستەكانی هیچ شتێک دەربارەی نەهاتووە تەنها یەک فەرموودە یان دووان کە ئەوانیش ناکرێنە حوججە). تەماشای: الفتاوى بكە (٥١٩/٢٢) .

## ١٠ پاڕانەوە لە كۆتا سێ یەكی شەودا .



لەو سوننەتانەی دوپاتكراونەتەوە لە كۆتایی شەودا پاڕانەوەیە ، جا ئەگەر لە قونوتەكەی كۆتایی شەودا پاڕایەوە ئەوا بەسیەتی ، وە ئەگەر نەپاڕایەوە ئەوا سوننەتە لەم كاتەدا بپارێتەوە ، چونكە ئەوە كاتێكە وەڵام دانەوەی دوعای تێدا دووپاتكراوەتەوە ،چونكە كاتی دابەزینی خوای گەورەیە بۆ ئاسمانی دونیا بە شێوازێک لایەقی زاتی مەزنی خۆی بێت، لە هەردوو كتێبی (صحیح)دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هريرة)ەوە – ڕەزای خوای لەسەر بێت – كەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : هەموو شەوێک پەروەردگارمان –بەرزو پیرۆزبێت- دادەبزێتە ئاسمانی دونیا (دابەزینێک شایستەو لایەقی خۆی بێت ) كاتێک سێیەكی كۆتایی شەو دەمێنێت ، دەڵێت : كێ لێم دەپاڕێتەوە وەڵامی دەدەمەوە ؟ كێ داوام لێ دەكات پێی دەبەخشم ؟ كێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەكات لێی خۆش دەبم ؟) (بوخاری) ڕیوایەتی كردووە بە ژمارە (١١٤٥) و (موسلیم) بە ژمارە (٧٥٨) .

## ١١ سوننەتە ئەگەر سەلامی دایەوە لە ویترەكەی بڵێت : (سبحان الملك القدوس) سێ جار ، لە سێیەمدا دەنگی بەرز دەكاتەوە .

**بەڵگەش لەسەر ئەوە :**

فەرموودەكەی (أُبي بن كعب)ە – ڕەزای خوای لێ بێت – دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نوێژی ویتردا ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ و﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ و﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ دەخوێند، وە ئەگەر سەلامی دایەوە دەیفەرموو : (سبحان الملك القدُوس) سێ جار )) نەسائی ڕیوایەتی كردووە ( ١٧٠٢). (النووي) و(الألباني) بە صحیحی دەزانن ، هەروەكو لە پێشدا باسكرا ، وە لە فەرموودەكەی (عبدالرحمن بن أبزى) – ڕەزای خوای لێ بێت – (وە لە سێیەم (سبحان الملك القدوس) دا دەنگی بەرز دەكردەوە) ئەحمەد ڕیوایەتی كردووەبە ژمارە (١٥٣٥٤) و نەسائی بە ژمارە (١٧٣٤) و الألباني بە (صحيح) داناوە ( تحقيق مشكاة المصابيح ١/ ٣٩٨) .



## ١٢ سوننەتە خێزانەکەی هەڵسێنێت بە مەبەستی ئەنجامدانی شەونوێژ.

جا سوننەتە پیاو خێزانەکەی هەڵسێنێت ، بۆ شەو نوێژ ، هەروەها ئافرەتیش ئەگەر هەستا ئەوا سوننەتە پیاوەکەی هەڵسێنێت ، هەروەها هەموو ئەهلەکەی بۆ ئەو مەبەستە ، ئەمەش لە رووی هاوکاری کردنی یەکترە لەسەر چاکە .

بەڵگەش لەسەر ئەوە :

فەرموودەکەی دایکە عائیشە – رەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو شەوێک کە نوێژەکەی دەکرد ، منیش لە نێوان خۆی و قیبلەدا راکشابووم ، جا ئەگەر بیویستایە ویتر بکات ئەوا منی هەڵدەستان و ویترەکەم دەکرد) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥١٢) و(موسلیم) بە ژمارە (٥١٢) .

وە لە (أم سلمه)ەوە – رەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت : شەوێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە خەو هەستا و دەیفەرموو : پاکی و بێگەردی بۆ خوا ، ئەمشەو چی شتێک لە گەنجینەکان دابەزیون و چی شتێک لە فیتنەکان دابەزیون ، ، خێزانەکانم هەڵسێنن بۆ ئەوەی نوێژ بکەن ، رەنگە کەسێکی داپۆشراو لە دونیادا رووت بێت لە دوارۆژدا) . (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٢١٨) .

## ١٣ لە سوننەتدا هاتووە کەوا ئەو کەسەی شەونوێژ دەکات ئەو کارە بکات کە بۆ خۆی سووک و ئاسانە ، بۆ ئەوەی کاریگەری لەسەر خشوعەکەی نەبێت .

ئەگەر تووشی بێزاری بوو ئەوا بە دانیشتنەوە نوێژەکەی دەکات .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی ئەنەس – رەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە ناو مزگەوتەوە و حەبلێک درێژ کرابووەوە لە نێوان دوو کۆڵەکەدا ، فەرمووی : ئەمە چییە ؟ وتیان: هی زەینەبە نوێژ دەکات ، جا ئەگەر تووشی تەمبەڵی هات یان بێزار بوو ئەوا دەستی پێوە دەگرێت ، فەرمووی : بیکەنەوە ، با هەر یەکێکتان بە چست و چالاکییەکەی خۆی نوێژ بکات ، جا ئەگەر تەمبەڵی گرتی یان بێزار بوو با دانیشێت) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١١٥٠) و (موسلیم) بە ژمارە (٧٨٤) .

وە ئەگەر تووشی خەوەنوچکە هات ئەوا با بخەوێت ، بۆ ئەوەی بە چست و چالاکی هەستێت و لە پاش ئەوە نوێژ بکات .

بە بەڵگەی فەرموودەی دایکە عائیشە – رەزای خوای لەسەر بێت – کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ئەگەر یەکێکتان تووشی خەوەنوچکە هات لە نوێژەکەیدا ئەوا با بخەوێت تاوەکو خەوەکەی لەسەر نەمێنێ ، چونکە ئەگەر یەکێکتان نوێژ بکات لە کاتێکدا توشی خەوەنوچکە هاتبێت ئەوا رەنگە لە جێی داوای لێخۆشبوون جوێن بە خۆی بدات) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢١٢) و(موسلیم) بە ژمارە (٧٨٦) .

هەروەها ئەگەر تووشی خەوەنوچکە و نمونەی ئەوە هات لە کاتێکدا لە شەودا قورئانی دەخوێند ئەوا سوننەتە بخەوێت بۆ ئەوەی بە هێز ببێتەوە .

بە بەڵگەی فەرموودەی (أبو هريرة) - رەزای خوای لەسەر بێت - کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ئەگەر یەکێکتان شەو هەستا و لەخوێندنەوەی قورئاندا زمانی دەچوو بە یەکدا و نەیدەزانی چی دەڵێت ئەوا با راکشێت) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٨٧) .

## ١٤ سوننەتە هەر کەسێک شەونوێژی لە دەست دەرچوو ئەوا بە رۆژ بیکاتەوە بەڵام بە جووت .

ئەگەر عادەتی وابووە سێ رکات ویتر بکات کەچی خەوی لێکەوت یان نەخۆش کەوت و نەیتوانی نوێژەکەی بکات ، ئەوا بە رۆژ چوار رکات دەکات ، وە ئەگەر عادەتی وابووە پێنج رکات بکات کەچی خەوی لێکەوت یان نەخۆش کەوت ئەوا بە رۆژ شەش رکات دەکات ، ئا بەم شێوەیە ، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو کارەی دەکرد ، وە لەبەر ئەوەی لە عادەتی وابووە کە یازدە رکات ویتری دەکرد ، ئەوا دایکە عائیشە دەربارەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : ئەگەر خەوی لێ بکەوتایە یان توشی ئازارێک بوایە لە شەونوێژەکەیدا ئەوا بە رۆژ دوازدە رکات نوێژی دەکرد ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە (٧٤٦) .



## دووەم : کاتی فەجر



**چەند کردارێکی تێدایە لە ڕێباز و هەدی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووە .**

### بانگدان ، وە چەند سوننەتێکی تێدایە :

#### ١ شوێنکەوتنی بانگبێژ لەوەی دەیڵێت.

سوننەتە هەرکەسێ گوێی لە بانگ بوو ئەوە بڵێت کە بانگبێژ دەیڵێت ، ئیللا لە (حي على الصلاة وحي على الفلاح)دا نەبێت ئەوا دەڵێت : لا حول ولا قوة الا بالله.

بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە (عبدالله بن عمرو بن العاص) ریوایەتی کردووە کەوا گوێی لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : (ئەگەر گوێتان لە بانگبێژ بوو ، ئەو چی فەرموو ئێوەش وا بڵێن ...) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٨٤) ، وە فەرموودەکەی (عمر بن الخطاب) دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ئەگەر بانگبێژ گوتی : (الله أكبر ، الله أكبر) یەکێک لە ئێوە گوتی : (الله أكبر الله أكبر ) ئەمجار گوتی : (أشهد أن لا إله إلا الله ) گوتی : (أشهد أن لا إله إلا الله ) ئەمجار گوتی : (أشهد أن محمدا رسول الله) گوتی : (أشهد أن محمدا رسول الله) ئەمجار گوتی : (حى على الصلاه ) گوتی : ( لا حول ولا قوة إلا بالله ) ئەمجار گوتی : (حي على الفلاح ) گوتی : ( لا حول ولا قوة

إلا بالله ) ئەمجار گوتی : (الله أكبر ، الله أكبر ) گوتی : (الله أكبر ، الله أكبر ) ئەمجار گوتی : (لا إله إلا الله) گوتی : (لا إله إلا الله ) لە دڵییەوە ، ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٨٥) .

لە کاتی (تثويب)دا (واتە : وتنی الصلاة خير من النوم) لە نوێژی بەیانیدا جا هەر کەسێ شوێنی بانگبێژەکە کەوت ئەوا هەر ئەوە دەڵێت کە بانگبێژ دەیڵێت : (الصلاة خير من النوم) .

### ٢ وتنی ئەم زیکرە پاش دوو شەهادەتەکە .

سوننەتە لە پاش ئەوەی بانگبێژ وتی ( أشهد أن محمدا رسول الله) لە جاری دووەمدا ئەوە بڵێت کە لە فەرموودەکەی (سعد)ەوە هاتووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کەوا فەرموویەتی : هەر کەسێ بڵێت کاتێ گوێبیستی بانگبێژ بوو : شایەتی دەدەم کە هیچ خودایەک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت ، تەنها و بێ هاوەڵە و (محمد) (ﷺ) یش بەندە و نێردراوی ئەوە ، رازیم بەوەی کە (الله) پەروەردگارم بێت و (محمد) یش پێغەمبەر (ﷺ) و ئیسلام دین و ئاینم بێت . ئەوا لە تاوانەکانی خۆش دەبێت) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٨٦) .

### ٣ صەڵاوات دان لە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پاش بانگەکە .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (عبدالله بن عمرو) -رەزای خوایان لەسەر بێت- دەڵێت : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ئەگەر گوێبیستی بانگبێژ بوون ئەوەی کە ئەو دەیڵێت ئێوەش بیڵێن ، ئەمجار صەڵاواتم لەسەر بدەن ، چونکە هەرکەسێک یەکجار صەڵاواتم لەسەر بدات ئەوا خوای گەورە بە هۆی ئەو صەڵاواتەوە دە جار صەڵاواتی لەسەر دەدات ، ئەمجار داوای (الوسيلة)م بۆ بکەن ، ئەوە جێگا و پایەیەکە لە بەهەشتدا بۆ هیچ کەسێک نییە تەنها بۆ بەندەیەکە لە بەندەکانی خوا ، تکام وایە کە ئەو بەندەیە من بم ، جا هەر کەسێک داوای (الوسيلة)م بۆ بکات ئەوا شەفاعەتی منی بۆ حەڵاڵ دەبێت -بەر شەفاعەتی من دەکەوێت-) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٨٤) .

وە باشترین جۆری صەڵاوات دان : صەڵاواتی ئیبراهیمییە : « اللهم صلِ على محمد وعلى آل محمد، كما صليت على إبراهيم...»

### ٤ وتنی ئەو دوعایەی لە پاش بانگ هاتووە .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (جابر) -رەزای خوای لەسەر بێت- دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : هەر کەسێک گوێبیستی بانگ بوو بڵێت : (ئەی خودایە ..پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوە و نوێژ دامەزراوە ، ببەخشە بە پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) پلەوپایەی بەرزی (الوسيلة) و پلەوپایەی زیادە بە سەر دروستکراوەکان (الفضيلة) و ببیەرە ئەو شوێنە سوپاسکراوەی کە بەڵێنت پێداوە) ئەوا شەفاعەتی منی بۆ حەڵاڵ دەبێت لە رۆژی قیامەتدا (یان بەر شەفاعەتی من دەکەوێت لە رۆژی قیامەتدا ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦١٤) .



## ٥ دوعاكردن لە پاش بانگدان .

بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی لە (عبدالله بن عمرو) ەوە هاتووە – ڕەزای خوای لەسەر بێت - : كابرایەک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگبێژەكان فەزڵیان لە ئێمە زۆرترە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەوەی ئەوان دەیڵێن تۆیش بیڵێ ، ئەگەر تەواوت كرد ئەوا داوا بكە پێت دەبەخشرێت) أبوداود ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٥٢٤) و إبن حجر بە (حسن)ی داناوە (نتائج الأفكار ٣٦٧/١) والألباني (صحیح الكلم الطیب ص ٧٣) .

وە بە بەڵگەی فەرموودەكەی (أنس) -ڕەزای خوای لەسەر بێت- كەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت هەرگیز ڕەت ناكرێتەوە) .نەسائی ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٩٨٩٥) و إبن خزیمە بە صحیح ی داناوە (٤٢٥/٢٢١/١).

## سوننەتی فەجر ، چەند سوننەتێكی تێدایە :

سوننەتی فەجر یەكەم سوننەتە ڕاتیبەكانە بەندە لە ڕۆژەكەیدا ئەنجامی دەدات ، وە چەند سوننەتێكی تێدایە ، پێش ئەوەی باسی بكەین پێویستە هەندێ لە تایبەتمەندییەكانی سوننەتە ڕاتیبەكان ڕوون بكەینەوە ، سوننەتی ڕاتیبە بریتییە لە : ئەو سوننەتانەی بەردەوام لە گەڵ فەرزەكاندایە ئەویش دوازدە ركاتە .

لە (أم حبیبە)ەوە – ڕەزای خوای لەسەر بێت – دەڵێت : گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : (هەركەسێ لە شەو ڕۆژێكدا دوازدە ركات نوێژی كرد ، ئەوا خوای گەورە لە بەهەشتدا خانوویەكی بۆ دروست دەكات) (موسلیم) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٧٢٨) و (الترمذي) تەخریجی كردووە ، ئەمەشی بۆ زیاد كردووە : ((چوار ركات پێش نیوەڕۆ و دوو ركات لە پاشی و دوو ركات پاش مەغریب و دوو ركات پاش خەوتنان و دوو ركات پێش نوێژی بەیانی) (الترمذي) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٤١٥) ، وە فەرموویەتی : (حسن صحیح) .

باشتر وایە سوننەتە ڕاتیبەكان لە ماڵ ئەنجام بدرێن .

لە (زید بن ثابت) ەوە هاتووە – ڕەزای خوای لێ بێت – كەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەی خەڵكینە لە ماڵەكانتاندا نوێژ بكەن ، چونكە باشترین نوێژی كەسێكتان ئەوەیە لە ماڵەكەیدا ئەنجامی دەدات ئیللا نوێژە فەرزەكان نەبێت) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٧٢٩٠) و (موسلیم) بە ژمارە (٧٨١) .



## دووپاتکراوترین سونەتی راتیبە .

دووپاتکراوترین سونەتی راتیبە سونەتی فەجرە ، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەمەی خوارەوەیە :

أ) فەرموودەکەی دایکە عائیشە – رەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت : (هیچ سونەتێک نەبووە زیاتر پارێزگاری لێ کردبێت و دەستی پێوە گرتبێت وەکو دوو رکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١١٩٦) و (موسلیم) بە ژمارە (٧٢٤) .

ب) فەرموودەکەی دایکە عائیشە –رەزای خوای لەسەر بێت- لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی : (دوو رکاتەکەی بەیانی باشترە لە هەموو دونیاو ئەوەی لە دونیادا هەیە) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٢٥) .

## سونەتی فەجر بە چەند کارێک تایبەتمەند کراوە :

یەکەم : دروستە لەسەفەر و شاردا بکرێت هەروەکو لە هەردوو کتێبی (صحیح)دا هاتووە ، بەڵام جگە لەو لە سونەتە راتیبەکان ، سونەت وایە لە سەفەردا وازیان لێ بهێنرێت وەکو راتیبەی نیوەڕۆ و مەغریب و خەوتنان .

دووەم : پاداشتەکەی ئەوەیە کە چاکترە لە هەموو دونیا و ئەوەی تیایدایە – هەروەکو لە پێشدا باسکرا-.

سێیەم : سونەتە بەسووکی ئەنجام بدرێت ، وە لە پێشدا بەڵگەی ئەوە باسکرا .

هەروەها بەڵگە لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی دایکە عائیشەیە – رەزای خوای لەسەر بێت – دەیفەرموو : پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو رکاتەکەی نوێژی بەیانی دەکرد ، هێندە بە سووکی ئەنجامی دەدا تەنانەت من دەمگوت : ئایە سورەتی (الفاتحة)ی خوێند یان نا؟! (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١١٧١) و (موسلیم) بە ژمارە (٧٢٤) .

بەڵام مەرجە : ئەم بە سووک ئەنجامدانە یەکێک لە واجیباتەکان لەکەدار نەکات ، یان کار بگاتە ئەوەی لە نوێژەکەیدا دەنوک بدات لە زەوییەکە ، ئەوا بکەوێتە ناو شتێکەوە نەهی لێ کرابێت .

چوارەم : سونەتە لە سونەتی بەیانیدا لە پاش (الفاتحة) سورەتی ﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾ بخوێنێت ، وە لە دووەمدا ﴿ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾. بخوێنێت ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو هريرة) کە (موسلیم) ریوایەتی کردووە .



یان لە پاش (الفاتحة) لە رکاتی یەکەمدا ئەم ئایەتە بخوێنێت :﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴾[البقره :١٣٦]) واتە : ئەی بڕواداران! بڵێن: ئێمە باوەڕمان بەخواو بەو(قورئان)ـە بۆمان دابەزیوە هەیە وە بەو بەرنامەیە کە بۆ (ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و نەوەکانیان) نێردراوە و بەوکتێبەش بە مووساو بەعیسا دراوە و بەوپەیامەش بەهەموو پەیامبەرانی تر دراوە لەلایەن پەروەرگاریانەوە هیچ فەرق وجیاوازییەکیش، ناخەینە نێوان هیچ کامێکیانەوە، وەبە تەنیاش ملکەچی فەرمانەکانی ئەوین، واتە: هەرفەرمانێ بەسەرماندا بدا، ئامادەین و سوپاسیشی دەکەین)

وە لە دووەمدا: (:﴿ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ كَلِمَةٖ سَوَآءِۭ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمۡ أَلَّا نَعۡبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشۡرِكَ بِهِۦ شَيۡـٔٗا وَلَا يَتَّخِذَ بَعۡضُنَا بَعۡضًا أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُولُواْ ٱشۡهَدُواْ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ﴾[آل عمران: ٦٤]) واتە : وەرن با ئێمەو ئێوە لەسەر و شەو بەرنامەیەک سووربین کە بۆ هەردوولامان چوونیەکەو یەکسانەو، پەیامبەرانیش هەموو هاودەنگ بوون لەسەری و، واز لەو تەفرەقەیە بێنن وەرن با جگە لەخوا کەسێکی تر نەپەرستین و، هیچ شتێکیش نەکەینە شەریک و هاوبەشی هەندێکیشمان لەباتی خوا نەکەینە خواو بپەرسترێن، واتە: لەنافەرمانی خوا گوێ بیستی یەکدی نەبین، جوولەکە عوزەیریان بەخوا دادەناو، گاورەکانیش عیسا! ئینجا ئەگەر هەر روویان لەوقسە راستەیە وەرگێڕاو بۆ یەکتاپەرستیی نەهاتن بەدەمتانەوە، بەراشکاوی پێیان بڵێن: دەسا ئێوە بەشایەت بن و بزانن کە بەڕاستیی ئێمە موسڵمان و ملکەچی بڕیارەکانی خواین و، سووریشین لەسەر دینی خۆمان و، خواش تاک و تەنیایەو، ئیتر نە عوزەیر خوایەو، نەعیسایش.)

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (إبن عباس) کە (موسلیم) ریوایەتی کردووە . ئەمەش لەو جۆرە سوننەتانەیە کە بە چەند جۆرێک هاتوون ، هەندێ جار ئەمەیان ئەنجام دەدات و هەندێ جار ئەوی تر .

پێنجەم : سوننەتە لە پاش دوو رکاتەکەی سوننەتی بەیانی لەسەر لای راست راکشێت .

بەڵگەش لەسەر ئەوە :

فەرموودەکەی دایکە عائیشە - رەزای خوای لەسەر بێت - پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر دوو رکاتەکەی فەجری بکردایە پاشان لە سەر لای راستی رادەکشا) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١١٦٠) و (موسلیم) بە ژمارە (٧٣٦) .

## رۆیشتن بۆ مزگەوت و چەند سوننەتێکی تێدایە :

لەبەر ئەوەی نوێژی بەیانی یەکەم نوێژە لە رۆژەکەدا کەوا کەسێک بە هۆیەوە بڕوات بۆ مزگەوت، جا چەند کارێک هەن سوننەتن لە کاتی رۆیشتن بۆ مزگەوت ئەنجام بدرێن :

### ١ سوننەتە زوو بڕوات بۆ مزگەوت .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو هريرة) – رەزای خوای لەسەر بێت –دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ئەگەر دەزانن چەند پاداشت لە زوو رۆیشتندا هەیە بۆ مزگەوت ئەوا پێشبڕکێیان بۆ دەکرد ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦١٥) و (موسلیم) بە ژمارە (٤٣٧) .

وە (التهجير) : واتە : رۆیشتن بۆ مزگەوت لەسەرەتای کاتەکەیدا .



### ٢ بە دەستنوێژەوە لە ماڵ دەرچێت بۆ ئەوەی هەنگاوەکانی بۆ بنوسرێت

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو هريرة) = رەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (نوێژی پیاوێک بە جەماعەت زیاترە لە نوێژەکەی لە ماڵەکەی و نوێژەکەی لە بازارەکەیدا بە بیست و هێندە پلە ، ئەویش ئەگەر یەکێکیان دەستنوێژی شوشت بە دەستنوێژێکی پوخت و جوان ئەمجار هات بۆ مزگەوت، هیچ شتێک نایجوڵێنێتەو و لە جێگەی خۆی هەڵی ناسێنێت ئیللا نوێژ نەبێت ، مەبەستی هیچ نییە تەنها نوێژ نەبێت، هیچ هەنگاوێک نانێت ئیللا پلەیەک بەرز دەبێتەوە و تاوانێکی لەسەر دەسڕێتەوە تاوەکو دەچێتە مزگەوتەوە ، جا ئەگەر چووە ناو مزگەوتەوە ئەوا لە نوێژدایە مادام نوێژەکەی حەپسی کردووە ، وە فریشتەکان صەڵاوات لەسەر کەسێکتان دەدەن مادام لەو مەجلیسەدایە کە نوێژەکەی تیادا کردووە، دەڵێن : ئەی خوایە .. رەحمی پێ بکە ، ئەی خوایە .. لێی خۆشبە ، ئەی خوایە .. تەوبەی لێ قبوڵ بکە، بە مەرجێ ئازار بە کەس نەگەیەنێت و دەستنوێژەکەی بەتاڵ نەبێـتەوە) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٤٩) .



## ٣ به هێمنی و لەسەر خۆیی و وەقارەوە بۆ نوێژ دەرچێت..

به بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو هريرة) – ڕەزای خوای لەسەر بێـت - لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەفەرموێت : (ئەگەر گوێتان لە قامەت بوو ئەوا بەرەو نوێژ بەرێ بکەون ، بە لەسەرخۆیی و هێمنی و وەقارەوە ، وە پەلە مەکەن ، ئەوەندەی پێیدا گەیشتن لە نوێژەکە ئەنجامی بدەن و ئەوەی لە دەستان دەرچوو ئەوا لە پاشاندا تەواوی بکەن) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٣٦) و (موسلیم) بە ژمارە (٦٠٢) .

نەوەوی- ڕەحمەتی خوای لێ بێت- دەفەرموێت : (السكينه) : واتە: لەسەرخۆیی لە جوڵەدا و دوورکەوتنەوە لە شپرزی و کاری بێ کەڵک ، وە (الوقار) : لە ڕواڵەتدایە وەکو چاو داپۆشین و دەنگی نزم و ئاورنەدانەوە) (شرح مسلم للنووی ، حديث (٦٠٢) باب استحباب إتيان الصلاة بوقار، وسكينة، والنهي عن إتيانها سعياً).

## ٤ پێشخستنی پێی ڕاست لە کاتی چوونە ناو مزگەوتەوە و پێشخستنی پێی چەپ لە کاتی دەرچووندا .



به بەڵگەی فەرموودەکەی (أنس) – ڕەزای خوای لەسەر بێت – فەرموویەتی : لە سوننەتدایە ئەگەر چویتە ژوورەوە بۆ مزگەوت پێی ڕاستت پێش بخەیت و ئەگەر دەرچوویت پێی چەپت پێش بخەیت ) الحاكم ڕیوایەتی کردووە (٣٣٨/١) و بە (صحيح)ی داناوە لەسەر (شرط)ی (موسلیم) .

## ٥ ئەو زیکرە بڵێت کە دەربارەی چوونە ژوورەوە و دەرچوون هاتوون

به بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو حميد) یان (أبو أسيد) فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر یەکێکتان چوونە مزگەوتەوە با بڵێت : ئەی خودایە .. دەرگاکانی ڕەحمەتی خۆتم لێ بکەرەوە . وە ئەگەر دەرچوو ئەوا با بڵێت : ئەی خوایە .. من داوای فەزڵی تۆ دەکەم ) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٧١٣) .

## ٦ دوو ڕکات نوێژی (تحيه المسجد) بکات .

ئەمەش ئەگەر زوو هات بۆ نوێژ ، ئەوا سوننەتە دانەنیشێت تاوەکو دوو ڕکات نوێژ دەکات ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو قتادة) – ڕەزای خوای لەسەر بێت – فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ئەگەر یەکێکتان چوونە مزگەوتەوە ئەوا با دانەنیشێت تاوەکو دوو ڕکات نوێژ دەکات) (بوخاري) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (١١٦٣) و (موسلیم) بە ژمارە (٧١٤) .

وە سوننەتی پێش نوێژە فەرزەکان جێگای دوو ڕکاتەکەی (تحيه المسجد) دەگرێتەوە ئەگەر دوو ڕکاتی پێشی هەبێت وەکو فەجر و نیوەڕۆ یان سوننەتی چێشتەنگاو ئەگەر لە کاتی چیشتەنگاودا

چووە مزگەوتەوە ، یان نوێژی ویتر ئەگەر لە مزگەوتدا ئەنجامی دا ، یان فەرز ، چونکە مەبەست لە (تحية المسجد) ئەوەیە : کەوا دانەنیشێت تاوەکو نوێژێک بکات ، چونکە لەوەدا ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتەکانی تێدایە ، بۆ ئەوەی نەچێتە مزگەوتەوە بە بێ نوێژ .

## ٧ سوننەتە پیاوان دەستپێشخەری بکەن بۆ ریزی پێشەوە ، چونکە ئەوە باشترین ریزە ، وە بۆ ئافرەتان باشترین ریز کۆتا ریزە .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو هريرة) – رەزای خوای لێ بێت – کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (باشترین ریزی پیاوان یەکەمەکەیەتی و خراپترینی کۆتاییەکەیەتی ، وە باشترین ریزی ئافرەتان کۆتاییەکەیەتی و خراپترینی یەکەمەکەیەتی) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٤٠)

(خيرها- باشترین -) : واتە : پاداشت و فەزڵی زۆرترە . وە (شرُها- خراپترین-) واتە : پاداشت و فەزڵی کەمترە .

ئەم فەرموودەیە باسی ئەوە دەکات ئەگەر پیاوان و ئافرەتان بە جەماعەت نوێژیان کرد و هیچ شتێک لە نێوانیاندا نەبێت وەکو دیوار و نمونەی ئەوە ، ئەوا لەو کاتەدا باشترین ریزی ئافرەتان کۆتایەکەیەتی ، چونکە ئەمە پۆشتەترە بۆیان لە چاوی پیاوان ، بەڵام ئەگەر شتێک لە نێوانیاندا هەبێت وەکو دیوار و نمونەی ئەوە ، یان وەکو ئەوەی ئەمڕۆ لە زۆربەی مزگەوتەکاندا هەیە بەوەی کە نوێژگەیەکی تایبەت بۆ ئافرەتان دەکرێت بە سەربەخۆیی، ئەوا لەم کاتەدا باشترین ریزی ئافرەتان یەکەمەکەیەتی ، چونکە هۆکاری نزیک بوون لە پیاوانەوە نەماوە ، چونکە حوکمەکان لە گەڵ هۆکارەکەیدا دەسوڕێنەوە بە بوون و نەبوون ، وە لەبەر گشتگیری ئەو فەرموودانەی دەربارەی ریزی یەکەم هاتوون ، لەوانە :

فەرموودەکەی (أبو هريرة) – رەزای خوای لێ بێت – کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر خەڵکی دەزانن چی لە بانگ و ریزی یەکەمدا هەیە – لە پاداشت- ئەمجار هیچ چارەیەکیان نەبوایە بۆ دیاری کردنی بانگبێژ و ریزی یەکەم تەنها بە قورعەکردن نەبێت ئەوا قورعەیان بۆ دەکرد ، وە ئەگەر خەڵکی بزانن چی لە زووهاتندایە بۆ مزگەوت – بۆ نوێژی نیوەڕۆ لە پاداشت- ئەوا پێشبرکێیان بۆ دەکرد ، وە ئەگەر بزانن چی لە نوێژی عیشا و بەیانیدا هەیە – لە پاداشت – ئەوا بۆی دەهاتن ئەگەر بە گاگۆڵکێیش بوایە) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦١٥) و (موسلیم) بە ژمارە (٤٣٧) .

## ٨ سوننەتە کەسی مەئموم نزیک بێتەوە لە ئیمامەکەی .

باشتر وایە لە حەقی مەئمومدا لە رووی رێکخستنی یەوە بۆ نوێژ ریزی یەکەمە هەروەکو لە پێشدا باسکرا ، ئەمجار سوور بێت لەسەر ئەوەی نزیک ببێتەوە لە ئیمام ، جا نزیکترین لە لای راستەوە یان لای چەپەوە ئەوا باشترینە .

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (عبدالله بن مسعود) و – رەزای خوای لێ بێت – دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (با کەسە پێگەیشتوو و عاقڵەکان لێم نزیک ببنەوە) أبو داود ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٧٤) و (الترمذي) بە ژمارە (٢٢٨) ، جا مەبەست لە (ليليني) واتە : با لێم نزیک ببێتەوە ، ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا نزیک بوونەوە لە ئیمام داواکراوە لە هەر لایەکەوە بێت .



# سوننەتەکانی ناو نوێژ



نەڕۆیشتنت بۆ نوێژی جەماعەت لە مزگەوت لە چەند فەزڵێک بێ بەشت دەکات ، تەنانەت هەنگاوەکانت بۆ مزگەوت لای خوای گەورە چەندین پلە بەرزت دەکاتەوە و لە تاوانەکانت دەسڕێتەوە.

## نوێژ چەندین سوننەتی هەیە ، باسی چەند دانەیەکی دەکەین لەوانە :

### أ سوترە ، وە ئەمانەی خوارەوە سوننەتن تیایدا :

#### ١ سوننەتە سوترەیەکی هەبێت .

سوترە سوننەتە بۆ ئیمام و کەسی تاک ، بەڵام مەئموم ئەوا سوترەی ئیمام سوترەیە بۆ ئەویش ، جا دانانی سوترە سوننەتە .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو سعيد الخدري) – ڕەزای خوای لێ بێت – لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ، تێیدا هاتووە : (ئەگەر یەکێکتان نوێژی کرد ڕووەو شتێک سوتری دەکرد لە خەڵکی ....) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٠٩) و (موسلیم) بە ژمارە (٥٠٥) .وە ئەو فەرموودانەی دەربارەی سوننەت بوونی سوترە هاتوون زۆرن ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەوگە (سرير) و دیوار و بنەدار و دار و حەربە و عەنەزە و وڵاخ و جگە لەوانەی کردووەتە سوترە .

سوترە دروستە لە ئاوەدانی و دەشتدا، لە شار و سەفەردا، جا ئەگەر ترسا لەوەی کەسێک تێپەڕێت یان نەترسا، چونکە فەرموودەکان جیاوازییان نەکردووە لە نێوان ئاوەدانی و دەشتدا، وە چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە شار و سەفەردا سوترەی بە کار دەهێنا، هەروەکو لە فەرموودەکەی (أبو جحيفة)دا هاتووە – ڕەزای خوای لێ بێت- (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٠١) و (موسلیم) بە ژمارە (٥٠٣) .



## ٢ سوننەتە نزیک ببێتەوە لە سوترەکە.

وە ئەگەر لە سوترەکە نزیک بوویەوە ، ئەوا سوننەتە لە نێوان جێی سوجدەکەی و سوترەکە بە ئەندازەی جێی تێپەڕبوونی مەڕێک بێت .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (سهل بن سعد الساعدی) – ڕەزای خوای لەسەر بێت – لە نێوان نوێژگەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و دیوارەکە جێی تێپەڕبوونی مەڕێک بوو (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٩٦) و (موسلیم) بە ژمارە (٥٠٨) . مەبەست لە نوێژگە (المصلى): جێگای سوجدەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) ، وە لە ئەحمەد و أبو داود دا هاتووە کەوا لە نێوان خۆی و سوترەکەیدا سێ باڵ بووە ، ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٢٣١) و أبو داود بە ژمارە (٢٠٢٤) و الألباني بە صحيحی داناوە (صحيح أبو داود ٢٦٣/٦) وە بنەمای فەرموودەکە لە (بوخاری)دا هەیە بە ژمارە (٥٠٦) ، ئەمەش بە پێی ئەوەی ئەگەر ڕاوەستا ئەوەندە لە نێوانیاندا دەبێت .



## ٣ سوننەتە ئەو کەسەی بە بەردەستی نوێژخوێندا تێدەپەڕێت ڕەد بکرێتەوە (بگێڕدرێتەوە).

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو سعيد ) – ڕەزای خوای لێ بێت – دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر یەکێک لە ئێوە نوێژی کرد بۆ شتێک سوتری دەکرد لە خەڵکی ، ئەمجار کەسێک ویستی بە بەر دەستیدا تێپەڕێت، ئەوا بە بە گەردنی پاڵی بنێت ، ئەگەر ڕازی نەبوو ئەوا با لە گەڵیدا بجەنگێت ، چونکە ئەوە شەیتانە ) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٠٥) .

بەڵام ئەگەر تێپەڕبووەکەی بەر دەستی نوێژ خوێن ئافرەت بوو یان سەگی ڕەش بوو یان گوێدرێژ بوو ، ئەوا لە سەر ڕای پەسەند ئەوەیە کە پاڵ بنرێت و دوور بخرێتەوە ، چونکە ئەوانە نوێژەکە دەبڕن هەروەکو لە فەرموودەکەی أبو ذر دا هاتووە – ڕەزای خوای لێ بێت – (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٥١٠)، بە جیاواز لە گەڵ جگە لەوانە چونکە ئەوانی تر نوێژەکە نابڕن ، ئەم ڕایەش مامۆستامان (ابن عثيمين) هەڵیبژاردووە .





### ٤ سوننەتە بۆ هەموو نوێژێک سیواک بکرێت

ئەمەش جێگای سێیەمە لەو جێگایانەی کە سیواک کردنی تێدا دەەپاتکراوەتەوە .

بەڵگەش لەسەر ئەوە :

فەرموودەکەی (أبو هريرة) – رەزای خوای لەسەر بێت- کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر گران و نارەحەت نەبوایە بۆ ئوممەتەکەم یان لەسەر خەڵکی ئەوا فەرمانم پێدەکردن بە سیواک کردن لە گەڵ هەموو نوێژێکدا ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٨٧)

## ب سوننەتە لە کاتی راوەستاندا ئەمانەی خوارەوە ئەنجام بدرێت :



### ١ دەست بەرزکردنەوە لە کاتی تەکبیرەی ئیحرامدا .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (إبن عمر) -رەزای خوایان لێ بێت – کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر دەستی بە نوێژ بکردایە ئەوا هەردوو دەستی بەرانبەر بە هەردوو شانەکانی بەرز دەکردەوە ، وە ئەگەر (الله أكبر)ی بکردایە بۆ کرنۆش و ئەگەر سەری بەرزکردایەتەوە لە کرنۆش ئەوا بە هەمان شێوە دەستەکانی بەرز دەکردەوە و دەیفەرموو : (سَمِعَ اللهُ لمن حَمِده ربَنا ولکَ الحمدُ ) وە ئەو کارەی لە سوجدەدا نەدەکرد )) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٣٥) و (موسلیم) بە ژمارە (٣٩٠) .

ابن هبيره – رەحمەتی خوای لێ بێت –دەفەرموێت : زانایان ئیجامعیان کردووە لەسەر ئەوەی دەست بەرزکردنەوە لە کاتی (الله اكبر)ی ئیحرامدا سوننەتە و واجیب نییە ) تەماشای (الأفصاح ١٢٣/١) بکە .

**وە ئەو جێگایانەی دەست بەرزكردنەوە كە دەقەكان دەربارەی هاتوون چوار جێگان :** لە كاتی (اللە أكبر) ی ئیحرامدا و لەكاتی كرنۆش بردندا و لە كاتی هەستانەوەی لێی ، ئەم سێ جێگایە لە هەردوو كتێبی (صحیح)دا لە (ابن عمر)ەوە سابت بووە هەروەكو لە پێشدا باسكرا ، وە جێگای چوارەم: لە كاتی هەستانە لە تەحیاتی یەكەم ، هەروەها ئەمەش سابتە لە (ابن عمر)ەوە – رەزای خوای لەسەر بێت – هەروەكو لە (صحیح البخاری)دا هاتووە .

جێگاكانی دەست بەرزكردنەوە كە دەق دەربارەیان هاتووە چوار جێگایە

| لە كاتی تەكبیرەی ئیحرامدا | وە لە كاتی كرنۆش بردندا | وە لە كاتی راستبوونەوە لە كرنۆش |
|---|---|---|

وە ئەم سێ جێگایە سەلمێنراون لە هەردوو كتێبی (صەحیح) دا لە (ابن عمر)ەوە – رەزای خوای لێ بێت- هەروەكو لە پێشدا باسكرا ، وە جێگای چوارەم :

**لە كاتی هەستان لە تەحیاتی یەكەم**

ئەمەش لە (ابن عمر)ەوە سەلمێنراوە – رەزای خوای لێ بێت – كە لە (صحیح البخاری)دا هاتووە

## ٢ سوننەتە لە كاتی دەست بەرزكردنەوەدا پەنجەكان كرابنەوە..

بە بەڵگەی فەرموودەكەی (أبو هريرة) – رەزای خوای لەسەر بێت – دەڵێت : ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستایە بۆ نوێژ ئەوا دەستەكانی بەرز دەكردەوە) ئەحمەد ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٨٨٧٥) و أبو داود بە ژمارە (٧٥٣) و (الترمذي) بە ژمارە (٢٤٠) و الألباني بە (صحیح)ی داناوە (صحيح أبي داود ٣/ ٣٤١).





## ٣ سوننەتە دەست بەرز كردنەوەكە بۆ ئەو جێگەیە بێت كە لە سوننەتدا هاتووە .

چەند دەقێك هاتوون بە دوو شێواز لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەربـارەی ئاستی دەست



بەرزکردنەوە ، لە هەردوو کتێبی (صحیح)دا هاتووە لە (ابن عمر)ەوە کەوا بەرانبەر بە هەردوو شانەکان بێت . (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٣٥) و (موسلیم) بە ژمارە (٣٩٠) .وە بەرانبەر بە لای سەرەوەی گوێیەکان هاتووە لە (موسلیم) دا لە فەرموودەی (مالک بن الحویرث) – رەزای خوای لەسەر بێت – (موسلیم) ریوایەتی کردووە (٣٩١) جا کەسی نوێژخوێن جۆراوجۆری دەکات هەندێ جار ئەمەیان دەکات و هەندێ جار ئەویتر .

## ٤ سوننەتە نوێژخوێن لە پاش تەکبیرەی ئیحرام دەستی راستی بخاتە سەر دەستی چەپی .

ئەمەش بە ئیجماعی زانایان ، هەروەکو (ابن هبیرە) ئەو ئیجماعەی گواستووەتەوە – رەحمەتی خوا لە هەموویان بیت – تەماشای (الأفصاح بکە ١٢٤/١) .

## ٥ سوننەتە بە دەستی راستی دەستی چەپی بگرێت .

شێوازی یەکەم : دەستی راستی دەخاتە سەر دەستی چەپی ، بە بەڵگەی فەرموودەی (وائل بن حجر) – رەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت : پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی ئەگەر لە نوێژدا راوەستابا ، بە دەستی راستی دەستی چەپی دەگرت) أبو داود ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٥٥) و نەسائی بە ژمارە (٨٨٨) ، وە الألباني بە صحیحی داناوە ..

شێوازی دووەم : دەستی راستی دەخاتە سەر باڵی چەپی ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (سهل بن سعد) دەڵێت : خەڵکی فەرمانیان پێدەکرا کەوا دەستی راستیان بخەنە سەر باڵی چەپیان لە نوێژدا ) . (بوخاری) ریوایەتی کردووەبە ژمارە (٧٤٠).

جا جارێک دەیخاتە سەر دەستی و جارێک دەیخاتە سەر باڵی ، بۆ ئەوەی جۆراوجۆر بکات لە جێبەجێ کردنی سوننەتدا .





## ٦ سوننەتە دوعای دەستپێكردنی نوێژ (الاستفتاح) بڵێت .

دوعای دەستپێكردنی نوێژ چەند شێوازێكی هەیە ، موستەحەببە جۆراوجۆری بكات ، جارێك ئەم شێوازە بڵێت و جارێك ئەویتر ، وە لەو دوعایانەی هاتوون :

أ ( پاكی و بێگەردی و سوپاس و ستایش تەنها بۆ تۆیە-ئەی خودایە- و ناوی تۆ پیرۆز و بەرەكەتی زۆرە و دەسەڵاتت گەورە و بڵندە و هیچ خودایەك نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ) ئەحمەد ریوایەتی كردوو بە ژمارە (١١٤٧٣) وأبوداود بە ژمارە (٧٧٦) الترمذي بە ژمارە (٢٤٣) و نەسائی بە ژمارە (٩٠٠) لە فەرموودەی (أبوسعید)ەوە ، وە فەرموودەكە چەند قسەیەكی لەسەرە و چەند رێگایەكی هەیە پێی بە هێز دەبێتەوە و (ابن حجر) بە (حسن)ی داناوە (نتائج الأفكار ٤١٢/١)

ب (سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە سوپاسێكی زۆر و پاك و پیرۆز و پڕ بەرەكەت ) وە لە فەزڵی ئەم زیكرەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ( بە راستی دوازدە فریشتەم بینی دەستپێشخەرییان دەكرد كامیان بەرزی بكەنەوە) (موسلیم) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٦٠٠) لە فەرموودەی (أنس)ەوە – رەزی خوای لەسەر بێت-

ج (ئەی خودایە .. نێوان من و تاوانەكانم دوور بخەرەوە هەروەكو چۆن رۆژهەڵات و رۆژئاوات لە یەك دوور خستۆتەوە ، ئەی خودایە.. لە تاوانەكانم پاكم بكەرەوە هەروەكو چۆن كراسی سپی لە چڵك پاك دەكرێتەوە ، ئەی خودایە .. لە تاوانەكانم بمشۆرەوە بە بەفر و ئاو و تەرزە ) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٧٤٤) و (موسلیم) بە ژمارە (٥٩٨) . لە فەرموودەی (أبو هريرة) ەوە – رەزای خوای لەسەر بێت-

د خوا گەورەیە و شایستەی گەورەییە(هەرە گەورەیە) ، سوپاس و ستایشێكی زۆر و بێ پایان بۆ خوا ، پاكی و بێگەردی بۆ خوا بەیانیان و ئێواران ) وە دەربارەی فەزڵی ئەم زیكرە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (سەیرم پێ دەهات ، دەرگاكانی ئاسمانی بۆ كرایەوە) (موسلیم) ریوایەتی كردوو بە ژمارە (٦٠١) لە فەرموودەی (ابن عمر) ەوە – رەزای خوایان لەسەر بێت -

## ٧ ئیستیعازە كردن

( واتە : پەناگرتن بە خوا لە شەڕی شەیتان و خراپەی ، بە وتنی : وتنی أعوذ بالله من الشيطان الرجيم).

ئیستیعازە سوننەتە ، وە سوننەتە جۆراوجۆری بكات لە شێوازەكانی ئیستیعازەكردندا ، جارێ ئەمەیان بڵێ و جارێك ئەویتر ، لەو شێوازانەی هاتوون :



أ «أعوذ بالله من الشـيطان الرجيم».

ئەمەش ئەو شێوازەیە جمهوری زانایان – رەحمەتی خوایان لەسەر بێت – هەڵیانبژاردووە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت : ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ [النحل : ٩٨]..واتە : جا هەركە ویستت قورئان بخوێنی بەرلەوە (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) بكەو هەر بەخوا پەنا بەرە لەپیلان و وەسوەسەی شەیتانی دوورەوە خراو، هەتا نەتوانێ لە وردبوونەوە لەماناو مەبەستی قورئان رێت لێبگرێت)

ب «أعوذ بالله السميع العليم من الشـيطان الرجيم»بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ [فصلت: ٣٦].واتە : هەركاتێكیش لەلایەن شەیتانەوە تووشی خەتەرەو وەسوەسەیەک بوویت، ویستی تۆپاداشتی خراپە، بەخراپە بدەیتەوە، خێرا پەنابەرە بەر خوا، چونكە تەنها ئەوە بیسەری زانا)

## ٨ بەسمەلە (واتە : وتنی: بسم الله الرحمن الرحيم)

سوننەتە لە پاش ئیستیعازەكردن بەسمەلە بكات و بڵێت : (بِسْمِ اللّهِ الرَحْمنِ الرَحِيمِ) بە بەڵگەی فەرموودەكەی (نعيم المجمر) – رەزای خوای لەسەر بێت – دەڵێت : لە پشت (أبو هريرة)وە نوێژم كرد ، (بِسْمِ اللّهِ الرَحْمنِ الرَحِيمِ)ی خوێند ، ئەمجار سورەتی (الفاتحة) ی خوێند ... ) وە تێیدا هاتووە: (سوێند بەو كەسەی گیانی منی بە دەستە من لە هەموتان زیاتر نوێژەكەم بە نوێژی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەچێت) نەسائی ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٩٠٦) و ابن خزيمه و بە صەحیحی داناوە (٢٥١/١)، وە الدار قطني فەرموویەتی : ئەمە فەرموودەیەكی (صحيح)ە و هەموو راوییەكانی جێی متمانەن (سیقەن). السنن (٤٦/٢) .

هەروەها ئەوەی لە واجیب بوون لای دەدات : پێغەمبەری خوا (ﷺ) كابرای فێر نەكرد كە لە نوێژەكەیدا هەڵەی كردبوو ، بەڵكو رێنموویی كرد بۆ خوێندنەوەی سورەتی (الفاتحة) ، هەروەكو لە فەرموودەكەی (أبو هريرة) دا هاتووە – رەزای خوای لێ بێت – (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٧٥٧) و (موسلیم) بە ژمارە (٣٩٧) .

## ٩ وتنی (آمین) لە گەڵ ئیمامدا .

ئەویش ئەگەر ئیمام سورەتی (الفاتحة)ی بە ئاشكرا خوێند ئەوا سوننەتە مەئمومەكان بڵێن ئامین، كاتێ ئیمام ئامین دەكات ، بە بەڵگەی فەرموودەكەی (أبو هريرة) – رەزای خوای لەسەر بێت – كەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((ئەگەر پێشنوێژ (آمین) ی كرد ئێوەش (آمین) بكەن ، جا هەركەسێک (آمین)ەكەی لە گەڵ (آمین)ی فریشتەكاندا جووت بوو ئەوا خوای گەورە لە تاوانەكانی پێشووی خۆش دەبێت ) . (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٧٨٠) و (موسلیم) بە ژمارە (٤١٠)

### ١٠ خوێندنی سورەتێک لە پاش (الفاتحة) .

خوێندنەوەی سوننەتە لە رکاتی یەکەم و دووەمدا ، ئەمەش قسەی جمهوری زانایانە – رەحمەتی خوای لێ بێت – بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو قتادة) =رەزای خوایٚ لەسەر بێت - دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دوو رکاتە یەکەمەکەی نیوەڕۆدا سورەتی (الفاتحة)ی دەخوێند ، وە دوو سورەتی تر لە یەکەمیاندا درێژی دەکردەوە و لە دووەمدا کورتی دەکردەوە ) . (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٥٩) و (موسلیم) بە ژمارە (٤٥١) .

بەڵام مەئموم لە نوێژە ئاشکراکاندا ئەوا سورەتەکەی پاش (الفاتحة) ناخوێنێتەوە بەڵکو گوێ لە ئیمام دەگرێت .

ابن قدامه – رەحمەتی خوای لێبێت - دەڵێت : هیچ کەسێک نازانین لە زانایان جیاواز بن لە گەڵ ئەوەی کەوا سوننەتە سورەتێک لە پاش (الفاتحة) بخوێنرێت لە دوو رکاتە یەکەمەکەدا لە هەموو نوێژێکدا ) تەماشای : المغنی بکە (٥٦٨/١).

### ج لە کاتی کرنۆشدا ئەمانەی خوارەوە سوننەتە :

### ١ سوننەتە هەردوو دەستی بخاتە سەر هەردوو ئەژنۆی ، وەکو کەسێک بیگرێت و پەنجەکانی لە یەک دوور دەکاتەوە ..



بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو حمید) دەڵێت : من لە هەمووتان زیاتر نوێژەکەی پێغەمبەری خوام (ﷺ) رەوان کردووە ، بینیم ئەگەر (الله أكبر)ی بکردایە ئەوا هەردوو دەستی تا ئاستی شانەکانی بەرز دەکردەوە و ئەگەر کرنۆشی ببردایە هەردوو دەستی لە سەر ئەژنۆکانی توند دەکرد و ئەمجار پشتی دەچەماندەوە بە راستی ....) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٢٨)، وە لە فەرموودەکەی أبو مسعود دا هاتووە : پەنجەکانی لە یەک جیادەکردەوە لە سەر ئەژنۆی ...) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٧٠٨١) و أبو داود بە ژمارە (٨٦٣) و نەسائی بە ژمارە (١٠٣٨) بە سەنەدێکی (حسن) وە شاهیدێکی هەیە لە فەرموودەی (وائل بن حجر) لای ابن خزیمە (٥٩٤) .





## ٢ سوونەتە ئەو كەسەی كرنۆش دەبات پشتی درێژ بكاتەوە بە راستی .



بە بەڵگەی فەرموودەكەی (أبو حميد الساعدي) كەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) : ( ئەگەر كرنۆشی ببردایە ئەوا هەردوو دەستی لە هەردوو ئەژنۆی توند دەكرد ئەمجار پشتی دەچەماندەوە و بە شێوەیەكی راستی ...) (بوخاری) ریوایەتی كردوو بە ژمارە (٨٢٨) و (هَصَرَ ظَهرَهُ) : واتە : چەماندییەوە بە شێوەیەكی راست و بە بێ ئەوەی قەوسی بكاتەوە ، هەروەها سوننەتە پشتی بەرانبەر بە سەری بێت ، نە بەرزی بكاتەوە و نە نزمی بكاتەوە ، بە بەڵگەی فەرموودەكەی دایكە عائیشە كە لە (موسلیم) دا هاتووە و تیایدا هاتووە ، لە وەصفی كرنۆشی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەفەرموێت :

((وە ئەگەر كرنۆشی ببردایە ئەوا سەری بەرز نەدەكردەوە و نزمی نەدەكردەوە بەڵكو لە نێوانیاندا بوو )) (موسلیم) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٤٩٨) .

(يُشْخِصُ) واتە : بەرزی نەدەكردەوە .

(وَلَمْ يُصوبْهُ) واتە : زۆر نزمی نەدەكردەوە .

## ٣ سوننەتە نوێژخوێن لە كاتی كرنۆشدا دەستەكانی لە لاكانی دوور بكاتەوە .



واتە : هەردوو دەستی لە لاكانی دوور بكاتەوە ، بە بەڵگەی فەرموودەكەی (أبومسعود)ی پێشوو، وە تیایدا هاتووە : ( ئەمجار كرنۆشی برد و هەردوو دەستی دوور خستەوە لە لاكانی و هەردوو دەستی خستە سەر هەردوو ئەژنۆی و پەنجەكانی لە یەك دوور كردەوە ... و فەرمووی: ئا بەم شێوەیە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی نوێژی دەكرد ) ئەحمەد ریوایەتی كردووە بە ژمارە (١٧٠٨١) و أبو داود بە ژمارە (٨٦٣) و نەسائی بە ژمارە (١٠٣٨) تەماشای : حاشیە (٢) بكە .

(المجافاه) : بریتییە لە دووورخستنەوە ، ئەمەش مەرجدارە بەوەی كە ئازاری ئەوانەی تەنیشتی نەدات، چونكە دروست نییە نوێژخوێن سوننەتێك بكات بە هۆیەوە ئازاری نوێژخوێنەكانی تر بدات .

نەوەوی -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- دەربارەی (المجافاه) فەرموویەتی : نازانم لە موستەحەب بوونیدا هیچ جیاوازییەک هەبێت لە لایەن یەکێک لە زانایانەوە ، ئیمامی (الترمذي) موستەحەب بوونی گواستوەتەوە لە کرنۆش و سوجدەدا بە ڕەهایی ) تەماشای : المجموع بکە (١٤٠/٣) .

## ٤ سوننەتە ئەو زیکرانەی بخوێنێت کە لە کرنۆشدا هاتوون .

سوننەتە ئەو کەسەی کرنۆش دەبات لە گەڵ (سبحان ربي العظيم)دا چەند زیکرێکی تر بڵێت کە لە کرنۆشدا هاتووە ، لەو زیکرانەی هاتوون :

أ (ئەی خودایە پاکی وبێگەردی و سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە ، ئەی خودایە .. لە تاوانەکانم خۆش بە ) . (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٩٤) و (موسلیم) بە ژمارە (٤٨٤) لە فەرموودەی دایکە عائیشەوە – ڕەزای خوای لەسەر بێت- .

ب تەسبیحات و پیرۆزی بۆ تۆیە پەروەردگاری فریشتەکان و جبریل) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٨٧) لە فەرموودەی دایکە عائیشەوە– ڕەزای خوای لەسەر بێت- .

ج ئەی خودایە .. بۆ تۆ کڕنۆشم برد و بە تۆ ئیمانم هێنا و تەسلیمی تۆ بوم ، بیستن و بینین و مۆخ و ئیسقان و دەمارەکانم هەموو ملکەچی تۆن)

(موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٧١) لە فەرموودەی عەلی یەوە – ڕەزای خوای لێ بێت -.

د پاکی و بێگەردی بۆ تۆیە ئەی خاوەنی شکۆ و دەسەڵات و توانایی و گەورەیی و شکۆمەندی) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٣٤١١) و أبوداود بە ژمارە (٨٧٣) و نەسائی بە ژمارە (١٠٥٠) لە فەرموودەی (عوف بن مالک)ەوە و الألباني بە صحیح داناوە (صحيح أبي داود ٢٧/٤).



## د هەستانەوە لە کرنۆش و چەند سوننەتێکی تێدایە :



### ١ درێژکردنەوەی ئەم روکنە .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (ثابت البناني) لە (ئەنەس) ەوە کەوا فەرموویەتی : من کورتی ناکەمەوە لەوەی نوێژتان پێ بکەم هەروەکو پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی نوێژی پێ دەکردین ، دەڵێت : جا ئەنەس شتێکی دەکرد نەمدەبینی ئێوە بیکەن ، ئەو ئەگەر سەری لە کرنۆش بەرز بکردایەتەوە بە تەواوی رادەوەستا ، تاوەکو یەکێک لە ئێمە دەیگوت : لە بیری چوو ، وە ئەگەر لە سوجدە سەری بەرز بکردایەتەوە هێندە دەمایەوە تاوەکو یەکێک لە ئێمە دەیگوت : لە بیری چوو (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٢١) و (موسلیم) بە ژمارە (٤٧٢) .

### ٢ جۆراوجۆر کردن لە شێوازەکانیدا : (ربنا ولك الحمد) لە نێوان ئەمانەی خوارەوەدا

أ « اللَّهُمَّ رَبَنَا وَلَكَ الحَمْدُ » (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٩٥) لە فەرموودەی (أبو هريرة)ەوە .

ب « اللَّهُمَّ رَبَنَا وَلَكَ الْحَمْدُ» (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٩٦) و (موسلیم) بە ژمارە (٤٠٤) لە فەرموودەی (أبو هريره) وە –رەزای خوای لەسەر بێت- .

ج « رَبَنَا وَلَكَ الْحَمْدُ » (بوخاري) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٩٩) و (موسلیم) بە ژمارە (٤١١) لە فەرموودەی دایکە عائیشەوە –رەزای خوای لەسەر بێت-

د «رَبَنَا لَكَ الْحَمْدُ «- (بوخاري) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٢٢) لە فەرموودەی (أبو هريرة) وە –رەزای خوای لەسەر بێت- .

جا جارێک ئەمەیان دەڵێت و جارێک ئەویتر

### ٣ سوننەتە ئەو زیکرانەی بڵێت کە لە پاش هەستانەوە لە کرنۆش هاتوون .

وە لەو زیکرانەی کە دروستە لە پاش هەستانەوە لە کرنۆش بگوترێت ئەمانەن :

أ) (ئەی خودایە .. سوپاس و ستایش بۆ تۆیە ، پڕ بە ئاسمانەکان و پڕ بە زەوی و پڕ بەو شتەی خۆت ویستت لێ بێت ، ئەی شایستەی ستایش و ڕێزلێنان ، ڕاسترین شتێک بەندە وتبێتی و هەمووشمان بەندەی تۆین ، ئەی خوایە هیچ ڕێگرێک نییە بۆ ئەو شتەی کە تۆ دەیبەخشی و بەخشەر نییە بۆ ئەو شتەی تۆ دەیگریتەوە و هیچ خاوەن سامان و دەوڵەمەندێک -سامان و دەوڵەمەندییەکەی- سوودی پێناگەیەنێ و ڕزگاری ناکا لە تۆ ) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٧٧) لە فەرموودەی (أبو سعید)ەوە –ڕەزای خوای لەسەر بێت- .

ب) سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە ، سوپاسێکی زۆر و پاک و پیرۆز و پڕ بەرەکەت) وە دەربارەی ئەم زیکرە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (بە ڕاستی دوازدە فریشتەم بینی دەستپێشخەرییان دەکرد کامیان بەرزی بکەنەوە ) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٠٠) (بوخاری) بە ژمارە (٧٩٩) .

ج) (ئەی خودایە .. پاکم بکەرەوە بە بەفرو تەرز و ئاوی سارد ، ئەی خودایە لە تاوان و گوناهەکانم پاکم بکەرەوە هەروەکو چۆن پۆشاکی سپی لە پیسی پاک دەکرێتەوە) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٧٦) .

وە ئەگەر کەسی موسڵمانان ئەم زیکرانەی گوت ئەوا دەتوانێت ئەم ڕوکنە درێژ بکاتەوە .

## هـ) سوجدە ، چەند سوننەتێکی تێدایە :

### ١ سوننەتە ئـەو کـەسـەی سوجدە دەبات دەستەکانی لە تەنیشتەکانی دوور بخاتەوە و سکی لە ڕانەکانی دوور بخاتەوە .



بە بەڵگەی فەرموودەی (عبدالله بن بحینة) –ڕەزای خوای لەسەر بێت- : کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر نوێژی بکردایە ئەوا دەستەکانی جیا دەکردەوە ، تاوەکو سپیایی بنباڵی دەبینرا (بوخاری) ڕیوایەتی کـردووە بە ژمـارە (٣٩٠) و(موسلیم) بە ژمارە (٤٩٥) .





وە فەرموودەکەی (میمونة) دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر سوجدەی ببردایە، ئەگەر بەرخێک بیویستایە لە نێوان دەستەکانیەوە بڕوایە ئەوا دەڕۆیشت ) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٩٦) ، لەمەشدا زیادەڕەوی بە دی دەکرێت لە جیاکردنەوەی دەستەکان ، جا سوننەتە دەستەکان لە یەک جیابکرێـنەوە بە مەرجێ نەبێتە هۆی ئازار بۆ دەوروبەری ، هەروکو لە دوورخستنەوەی دەستەکان لە کاتی کرنۆشدا باسکرا .

هەروەها لە سوننەتدا هاتووە کەوا کەسی نوێژخوێن ئەگەر سوجدەی برد ئەوا نێوان هەردوو ڕانی لە یەک جیادەکاتەوە و کۆیان ناکاتەوە ، وە سکی بە ڕانەکانی هەڵنەگرێت ، بەڵکو ڕانەکانی لە سکی دوور دەخاتەوە ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو حمید)–ڕەزای خوای لەسەر بێت- کە باسی شێوازی نوێژی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکات و دەڵێت : وە ئەگەر بڕوایەتە سوجدە هەردوو ڕانی لە یەک جیادەکردەوە و بە ڕانەکانی سکی هەڵنەدەگرت) أبوداود ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٣٥) ئەمەش سوننەتە بە ئیجماعی زانایان هەروەکو (شەوکانی) و جگە لەو گواستویانەتەوە .

شەوکانی –ڕەحمەتی خوای لێ بێت –دەفەرموێـت : فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر لەیەک جیاکردنەوەی نێوان هەردوو ڕانەکان لە سوجدەدا ، وە بەرزکردنەوەی سک لێیان ، وە هیچ جیاوازییەک لەوەدا نییە )) تەماشای : نیل الأوطار بکە (٢٥٧/٢) .



## ٢ سوننەتە ئـەو کەسەی سوجدە دەبات لێواری پەنجەکانی پێی ڕوو لە قیبلە بکات

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو حمید) –ڕەزای خوای لەسەر بێت- کەوا فەرموویەتی : من لە هەموتان زیاتر شێوازی نوێژەکەی پێغەمبەری خوام (ﷺ) ڕەوان کردووە ، وە تیایدا هاتووە : وە ئەگەر بچوایەتە سوجدە هەردوو دەستی دادەنا و فەرشی نەدەکرد و نەیدەگرتەوە ، وە لێواری پەنجەکانی پێی ڕووەو قیبلە دەکرد ) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٢٨) .

بەڵام پەنجەکانی دەستی لە کاتی سوجدەدا ئەوا سوننەت وایە بلکێن بە یەکەوە و هەردوو دەستی ڕووەو قیبلە بکات ، بە بەڵگەی ئەوەی کە سابت بووە لە (ابن عمر)ەوە–ڕەزای خوای لەسەر بێت- ، هەروەکو لە موطأي ئیمامی مالیکدا هاتووە (تەماشای : موطأ مالک) بکە ، هەروەها لە (مصنف ابن أبي شيبة)دا هاتووە لە (حفص بن عاصم)ەوە –ڕەزای خوای لەسەر بێت- فەرموویەتی: لە سوننەتدا هاتووە لە نوێژدا کە دەستەکانی ڕابخات و پەنجەکانی بە یەکەوە بلکێنێ و ڕووی لە قیبلە بکات) تەماشای : مصنف ابن أبی شیبە بکە (٢٣٦/١) ، وە شاهیدێکی هەیە لە فەرموودەی (وائل ابن

حجر)ەوە : کەوا ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بچوایەتە سوجدە پەنجەکانی دەلکاندە یەکەوە) وە (الهیثمي) بە (حسن)ی داناوە (مجمع الزوائد ٢/١٣٥).

### ٣ سوننەتە ئەو زیکرانە بڵێت کە بۆ کاتی سوجدە هاتوون .

سوننەتە ئەو کەسەی سوجدە دەبات لە گەڵ وتنی (سبحان ربی الأعلی)دا ئەو زیکرەکانی تر بڵێت کە لە سوجدەدا هاتوون ، لەو زیکرانەی هاتوون :

أ (ئەی خودایە پاکی و بێگەردی و سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە ، ئەی خودایە .. لە تاوانەکانم خۆش بە ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٩٤) و (موسلیم) بە ژمارە (٤٨٤) لە فەرموودەی دایکە عائیشەوە-رەزای خوای لەسەر بێت- .

ب (تەسبیحات و پیرۆزی بۆ تۆیە پەروەردگاری فریشتەکان و جبریل) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٨٧) لە فەرموودەی دایکە عائیشەوە -رەزای خوای لەسەر بێت-.

ج (ئەی خودایە .. من بۆ تۆ سوژدەم برد و باوەڕم بە تۆ هێناو تەسلیمی تۆ بووم ، ڕوومەتم سوژدەی بۆ ئەو کەسە برد کە دروستی کردوە و وێنەی کێشاوە و بیستن و بینینی بۆ داڕشتوە ، بەرزی و پیرۆزی بۆ باشترین بەدیهێنەرەکان ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٧١) لە فەرموودەی (عەلی) یەوە -رەزای خوای لەسەر بێت-.

د ئەی خودایە .. لە هەموو تاوانەکانم خۆشبە ، وردە و گەورەکان ، پێشینەکان و پاشینەکان، ئاشکرا و نهێنییەکان) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٨٣) لە فەرموودەی (أبو هریرة) وە-رەزای خوای لەسەر بێت- .

هـ ئەی خودایە .. من پەنات پێدەگرم بە رازیبوونت لە تووڕەییت ، بە لێبوردەییت لە سزاکەت، پەنا ئەگرم بە تۆ لە تۆ ، ناتوانم ستایشەکانی تۆ بژمێرم هەروەکو چۆن خۆت ستایشی خۆتت کردووە ) ، لە فەرموودەی دایکە عائیشەوە-رەزای خوای لەسەر بێت- ، جا سوننەتە تا دەتوانێت ئەم زیکرانە بڵێت لە سوجدەدا و جۆراو جۆری بکات ، ئاشکراشە ئەوەی واجیبە لە کرنۆشدا بگوترێت : (سبحان ربي العظیم) یەکجارە و ئەگەر زیاتری وت ئەوا سوننەتە ، هەروەها لە سوجدەیشدا وتنی (سبحان ربی الأعلی) یەکجار واجیبە ، بەڵام جاری دووەم و سێیەم ئەوا سوننەتە .



### ٤ سوننەتە دوعا زۆر بكات لە سوجدەدا .

بە بەڵگەی فەرموودەكەی (ابن عباس) - رەزای خوایان لێ بێت - كە لە (موسلیم) دا هاتووە : (بەڵام سوجدە ئەوا دوعای زۆر تیادا بكەن ، چونكە شایەنیەتی و بۆی هەیە وەڵام بدرێنەوە ) (موسلیم) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٤٧٩) .

## و سوننەتەكانی دانیشتن لە نێوان دوو سوجدەكەدا .



### ١ سوننەتە كەسی نوێژخوێن پێی چەپی فەرش بكات و لەسەری دانیشێت و پێی راستی بچەقێنێت بە زەوییەكەدا.

بە بەڵگەی فەرموودەكەی (أبو حمید الساعدی) - رەزای خوای لەسەر بێت - بە (مرفوع)ی هاتووە ، تێیدا هاتووە : (ئەگەر دانیشتایە لە نێوان دوو سوجدەكەدا ئەوا لەسەر پێی چەپی دادەنیشت وپێی راستی دەچەقاند بە زەوییەكەدا) (بوخاری) ریوایەتی كردوو بە ژمارە (٨٢٨) .

### ٢ درێژكردنەوە ئەم روكنە .

بە بەڵگەی فەرموودەكەی (ثابت البناني) - رەزای خوای لەسەر بێت - لە پێشدا باسكرا.

### ٣ سوننەتە هەركەسێ بیەوێ هەستێتەوە بۆ هەر ركاتێک ، دووەم یان چوارەم ، كەمێک دانیشێت پێش ئەوەی هەستێتەوە .

وە ئەم دانیشتنە پێی دەگوترێت : (جلسة الاستراحة) وە زیكرێكی تایبەتی نییە .

وە لە سێ فەرموودەدا سەلمێنراوە ، لەوانە :

فەرموودەكەی (مالك بن الحويرث) - رەزای خوای لەسەر بێت - كەوا پێغەمبەری خوای (ﷺ) بینی نوێژی دەكرد ، جا ئەگەر لە رەكاتە تاكەكانی نوێژەكەیدا بوایە ئەوا هەڵنەدەستا تاوەكو دادەنیشت) (بوخاري) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٨٢٣) و (مالك بن الحويرث) -رەزای خوای لەسەر بێت- ئەو كەسەیە كە ئەو فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بۆ گواستوینەتەوە كە دەفەرموێت : ( نوێژ بكەن هەروەكو چۆن منتان دەبینی نوێژم دەكرد ) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٦٣١).

وە زانایان جیاوازن لە سوننەت بوونی (جلسه الاستراحه) ، رای راست و دروست : کەوا ئەوە سوننەتە بە رەهایی ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (مالک) – رەزای خوای لەسەر بێت – ، وە ئەوەی سوننەت بوونی پەسەند کردووە بە رەهایی : النووی و الشوکانی وابن باز والألباني – رەحمەتی خوایان لێ بێت - هەروەها (اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والافتاء ) (تەماشای : فتاوی و مقالات متنوعه (٩٩/١١) و (فتاوی اللجنة الدائمة ) (٤٤٥/٦- ٤٤٦) بکە .

نەوەوی – رەحمەتی خوای لێ بێت – فەرموویەتی : (ئەمەش رای دروستە کە فەرموودە دروستەکان دەیسلمێنن) تەماشای : المجموع بکە (٤٤١/٣) .

## ز ئەو سوننەتانەی کە لە تەحیاتدا هاتوون :

### ١ سوننەتە پێی چەپی فەرش بکات لە تەحیاتدا و پێی راستی بچەقێنێت بە زەوییەکەدا.



ئەم شێوازە کەسی نوێژخوێن ئەنجامی دەدات لە پاش ئەوەی دووەم رکات دەکات بە کرنۆش و سوجدە و هەستان و دانیشتنیەوە ، جا ئەگەر نوێژەکە چوار رکاتی بێت یان سیانی یان دووانی ، جا لە هەموو تەحیاتێکدا لە رکاتی دووەمـدا شێوازی دانیشتنەکەی بەم شێوەیە دەبێت، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبوحميد الساعدی) – رەزای خوای لەسەر بێت – بە (مرفوع)ی ، تیایدا هاتووە : (جا ئەگەر لە رکاتی دووەمدا دانیشتایە ئەوا لە سەر پێی چەپی دادەنیشت و پێی راستی بە زەویدا دەچەقاند) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٢٨) وە فەرموودەکەی دایکە عائیشە – رەزای خوای لەسەر بێت - : (لە هەموو دوو رکاتێکدا تەحیاتی دەخوێند ، وە پێی چەپی رادەخست و پێی راستی دەچەقاند بە زەویدا) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٩٨) .

– بەڵام تەحیاتی کۆتایی لە نوێژە چوار رکاتی و سێ رکاتییەکاندا ، ئەوا شێوازەکەی لە پاشاندا روون دکەینەوە .







## ٢ سوننەتە جۆراو جۆر بکات لە دانانی دەستیدا لە کاتی تەحیاتدا.

وە دانانی دەستەکان لە کاتی تەحیاتدا دوو شێوازی هەیە :

**یەکەم :** هەردوو دەستی بخاتە سەر هەردوو رانی .

**شێوازی دووەم :** هەردوو دەستی بخاتە سەر هەردوو ئەژنۆی ، ئەویش بەوەی ئەژنۆی چەپی بە دەستی چەپی دەگرێت ، بەڵام دەستی راستی ئاماژەی پێ دەکات – هەروەکو لە پاشاندا روونی دەکەینەوە – بەڵام دەستی چەپ ئەوا هەردەم راخراوە .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (ابن عمر) – رەزای خوایان لەسەر بێت- دەفەرموێت :

(ئەگەر دانیشتایە لە نوێژدا ئەوا دەستی راستی دەخستە سەر رانی راستی و هەموو پەنجەکانی دەگرت و بە پەنجەی شایەتمانی ئاماژە دەکرد و دەستی چەپی دەخستە سەر رانی چەپی ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٨٠) ، وە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە : (وە بە دەستی چەپی ئەژنۆی دەگرت (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٧٩) .





### ٣ سوننەتە جۆراو جۆر بکات لە شێوازی دانانی پەنجەکانیدا لە کاتی تەحیاتدا .

وە دانانی پەنجەکان لە کاتی تەحیاتدا دوو شێوازی هەیە :

**شێوازی یەکەم :**

هەموو پەنجەکانی دەستی راستی بگرێت و بە پەنجەی شایەتمان ئاماژە بکات ، و دەستی چەپی راخستبێت .
بە بەڵگەی فەرموودەی (ابن عمر) - رەزای خوای لەسەر بێت - کە لە پێشدا باسکرا : (هەموو پەنجەکانی دەگرت و بە پەنجەی شایەتمان ئاماژەی دەکرد) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٨٠) .

**شێوازی دووەم :**

پەنجەکانی لەسەر شێوەی پەنجاو سێ گرێ بدات ، بەوەی کە پەنجەی توتە و براتوتە بگرێت و پەنجە گەورەکەی و پەنجەی ناوەراست بکاتە ئەڵقەیەک و بە پەنجەی شایەتمان ئاماژە بکات ، بەڵام پەنجەکانی دەستی چەپی رادەخات .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (ابن عمر) کە لە پێشدا باسکرا : ئەگەر - واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ)- دانیشتایە لە نوێژدا بۆ تەحیات خوێندن ئەوا دەستی چەپی دەخستە سەر رانی چەپی و دەستی راستی دەخستە سەر رانی راستی و بە پەنجەکانی وەکو پەنجاو سێ گرێی دەدا و بە پەنجەی شایەتمانی ئاماژەی دەکرد )) (موسلیم) ریوایەتی کردوو بە ژمارە (٥٨٠) .

### ٤ سوننەتە نوێژخوێن جۆراوجۆر بکات لە نێوان شێوازەکانی تەحیاتدا .

هەندێ جار ئەم شێوازە دەکات و هەندێ جار ئەویتر ، وە لەو شێوازانەی هاتوون :

أ (درود و پاڕانەوە و لاڵانەوە و وشەی پاک و چاک هەر بۆ خوایە ، سڵاو و رەحمەت و



بەرەکەتی خوات لە سەر بێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، سڵاو لە سەر ئێمەش و هەموو بەندە چاکەکانی خوای گەورە ، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت و شایەتی دەدەم کە (محمد) (ﷺ) بەندە و نێردراوی ئەوە )

(بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٢٠٢) و (موسلیم) بە ژمارە (٤٠٢) لە فەرموودەی (ابن مسعود)ەوە – رەزای خوای لەسەر بێت- .

ب) (درود و پاڕانەوە و لاڵانەوە و وشەی پاک و چاکی پیرۆز هەر بۆ خوایە ، سڵاو و رەحمەت و بەرەکەتی خوات لە سەر بێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، .... ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٠٣) لە فەرموودەی (ابن عباس)ەوە – رەزای خوایان لەسەر بێت – ئەمجار وەکو ئەوەی پێشوو تەواوی دەکات .

ج) « درود و پاڕانەوە و لاڵانەوە و وشەی پاک و چاک هەر بۆ خوایە ، سڵاو و رەحمەت و بەرەکەتی خوات لە سەر بێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ....) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٠٤) لە فەرموودەی (أبوموسى)وە ، ئەمجار وەکو ئەوەی پێشوو تەواوی دەکات .

## ٥ سوننەت وایە کە نوێژخوێن بەشێوازی تەوەروک دانیشێت بۆ تەحیاتی کۆتایی لە نوێژە سێ رکاتی و چوار رکاتییەکاندا .

مەبەست لەوەی کە دادەنیشێت بۆ تەحیاتی کۆتایی ئەگەر نوێژەکە چوار رکاتی یان سێ رکاتی بوو لەسەر (مقعد)ی دادەنیشێت ، جا لەسەر رانی چەپی دادەنیشێت ، وە تەوەڕوک بە چەند شێوەیەک هاتووە، بۆیە موستەحەببە لەو کاتەدا جۆراوجۆری بکات .

**لەو شێوازانەی هاتوون :**



أ) پێی چەپی فەرش بکات و لە لای راستییەوە دەری بکات و پێی راستی بچەقێنێت بە زەویدا، وە مقعدەی خۆی بخاتە سەر زەوی .

وە ئەم شێوازە (بوخاری) ریوایەتی کردووە لە فەرموودەی (أبوحميد الساعدى)یەوە – رەزای خوای لەسەر بێت - بە ژمارە(٨٢٨) .



ب) هەردوو پێی فەرش بکات و لای ڕاستییەوە دەری دەکات و مقعدەکەی دەخاتە سەر زەوی

وە ئەم شێوازە (أبو داود) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٣١) و (ابن حبان) بە ژمارە (١٨٦٧) و (البيهقى) (١٢٨/٢) لە فەرموودەی (أبو حميد الساعدى)یەوە – ڕەزای خوای لەسەر بێت- و الألباني بە صحيح ی داناوە – ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێت -

ئەوەش با بزانرێت کەوا تەوەڕوک لە سەر ڕای پەسەند لە هەموو دوا تەحیاتدا نییە ، بەڵکو لە دوا تەحیاتی نوێژە سێ ڕکاتی و چوار ڕکاتییەکاندایە نەک دوو ڕکاتییەکان .

## ٦ سوننەت وایە کەوا نوێژخوێن لە شێوازەکانی صەڵاوات دان لە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) جۆراوجۆر بکات .

جا چەند شێوازێک هاتوون لە صەڵاوەت دان لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)، سوننەت وایە جۆراوجۆری بکات ، وە لەو شێوازانەی هاتوون :

أ) (اللَّهُمَ صَلِ عَلى مُحَمَد ، وَعَلَى آلِ مُحَمَد ،كَمَا صَلَيْتَ عَلَى إبْرَاهِيمَ ، وَعَلَى آلِ إبْرَاهِيمَ إنَكَ حَميدٌ مَجيدٌ ، اللَهُمَ بَارِكْ عَلَى مُحَمَد ، وَعَلَى آلِ مُحَمَد ،كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إبْرَاهِيمَ ،وَعَلَى آلِ إبْرَاهِيمَ إنَكَ حَميدٌ مَجيدٌ) (بوخاري) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٣٧٠) لە فەرموودەی (كعب بن عجرة)ەوە – ڕەزای خوای لێ بێت - .

ب) (اللَّهُمَ صَلِ عَلَى مُحَمَد وَعَلَى آلِ مُحَمَد كَمَا صَلَيْتَ عَلَى آلِ إبْرَاهِيمَ ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَد وَعَلَى آلِ مُحَمَد كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إبْرَاهِيمَ ، فِي الْعَالَمِينَ ، إنَكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٠٥) لە فەرموودەی (أبومسعود الانصاري)یەوە – ڕەزای خوای لەسەر بێت - .

ج) (اللَهُمَ صَلِ عَلي مُحَمَد وَعَلَى أَزْوَاجِه وَذُرِيَتِه ،كَمَا صَلَيْتَ عَلَى آلِ إبْرَاهِيمَ ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَد وَعَلَى أَزْوَاجِه وَذُرِيَتِه، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إبْرَاهِيمَ ، إنَكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ) (بوخارى) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٣٦٩) و (موسلیم) بە ژمارە (٤٠٧) لە فەرموودەی (أبوحميد الساعدى) یەوە – ڕەزای خوای لەسەر بێت -

## ٧ سوننەت وایە پەنابگرێت بە خوای گەورە لە چوار شت پێش ئەوەی سەلام بداتەوە

ئەمەش قسەی جمهوری زانایانە – ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێت- بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو هريرة) کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر یەکێکتان دوایین تەحیاتی تەواوکرد ئەوا با پەنا

بگرێت بە خوا لە چوار شت : لە سزای دۆزەخ و لە سزای ناو گۆڕو لە فیتنەی ژیان و مردن و لە خراپەی (المسیح الدجال) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٣٢) و (موسلیم) بە ژمارە (٥٨٨) .

وە چەند دوعایەکی تر لە سوننەتدا هاتوون ، سوننەتە نوێژخوێن بە جۆراوجۆری بیلێت لە پێش سەلامدانەوە ، لەوانەی هاتوون :

أ (ئەی خودایە من پەنات پێ دەگرم لە تاوانباری و قەرزاری) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٣٢) و (موسلیم) بە ژمارە (٥٨٩) .

ب (ئەی خودایە.. من داوای بەهەشتت لێدەکەم و پەنات پێدەگرم لە ئاگر) أبو داود ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٩٢) و الألباني ئیسنادەکەی بە صحیح داناوە (صحیح أبي داود ٣٧٧/٢) .

ج (ئەی خودایە من ستەمێکی زۆرم لە نەفسی خۆم کردووە ، وە هیچ کەسێک لە تاوانەکان خۆش نابێت تەنها تۆ نەبێت ، بۆیە بە لێخۆشبوونێکی لای خۆتەوە لە تاوانەکانم خۆشبە و ڕەحمم لێ بکە ، هەر تۆ لێبوردە و میهرەبانی) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٣٢٦) و (موسلیم) بە ژمارە (٢٧٠٥) .

د (ئەی خودایە یارمەتیم بدە بۆ ئەنجامدانی زیکری تۆ و سوپاسی تۆ و جوان پەرستنی تۆ) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٢١١٩) و أبوداود بە ژمارە (١٥٢٢) و نەسائی بە ژمارە (١٣٠٤) و الألباني بە صحیح ی داناوە (صحیح الجامع ١٣٢٠/٢) .

هـ (ئەی خودایە .. من پەنات پێدەگرم لە ڕەزیلی و پەنات پێدەگرم لە ترسنوکی و پەنات پێدەگرم لەوەی بکەومە تەمەنێکی پەککەوتەیی و پەنات پێدەگرم لە فیتنەی دونیا و پەنات پێدەگرم لە سزای ناو گۆڕ )) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٣٧٠).

و (ئەی خودایە ..- لە ڕۆژی قیامەتدا – بە لێپرسینەوەیەکی سووک و ئاسان لێپرسینەوەم لە گەڵدا بکە) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٤٢١٥) و الألباني بە صحیح داناوە (تحقیق مشکاه المصابیح ٣ / ١٥٤٤) .

ئەمجار سەلام دەداتەوە بە ئاوردانەوەوە سەلام دەداتەوە ، وە ئاوردانەوەکەی لە نوێژدا سوننەتە، هەروەها زیادەڕەوی کردن لە ئاوردانەوەدا سوننەتە ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاوری دەدایەوە تاوەکو لە پشتییەوە سپێتی گۆنایان دەبینی ، لە (سعد بن أبي وقاص)ەوە هاتووە دەڵێت : (پێغەمبەری خوام (ﷺ) دەبینی سەلامی بە لای ڕاست و چەپیدا دەدایەوە تاوەکو سپێتی گۆنایم دەبینی ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٨٢) .

## ح ئەو زیکرە مەشروعانە لە پاش سەلامدانەوە لە نوێژە فەرزەکاندا هاتوون سوننەتن.

پێشەوا نەوەوی – ڕەحمەتی خوای لێ بێت- دەفەرموێت : ئیجماعی زانایان لەسەر ئەوە هەیە

کەوا زیکرکردن لە پاش نوێژەکان موستەحەبن) تەماشای : الأذكار بكە (ص٦٦) .

وە موستەحەببە دەنگ بەرز بکرێتەوە بەم زیکرانە ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (ابن عباس) – ڕەزای خوایان لەسەر بێت – ((دەنگ بەرز کردنەوە بۆ زیکر کاتێک خەڵکی لە نوێژە فەرزەکان دەبوونەوە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بووە) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٤١) و (موسلیم) بە ژمارە (٥٨٣) .

**زیکرەکانیش ئەمانەن :**

أ- سێ جار (أستغفر الله) دەکات و ئەمجار دەڵێت : (ئەی خودایە .. هەر تۆ سەلام و ئاشتیت و سەلام و ئاشتیش لە تۆوەیە ، پاکی و بێ کەمو کووڕی بۆ تۆ ئەی خاوەن شکۆ و ڕێز) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٩١) لە فەرموودەی (ثوبان)ەوە – ڕەزای خوای لەسەر بێت -

ب- هیچ پەرستراوێک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت ، تەنها و بێ هاوەڵە ، موڵک و سوپاس و ستایش تەنها بۆ ئەوە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە ، هیچ توانا و هێزێک نییە تەنها بە خوا نەبێت ، هیچ پەرستراوێک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت ، هیچ کەسێک ناپەرستین تەنها ئەو نەبێت ، نیعمەت و فەزڵ و ستایشی چاک بۆ ئەوە ، هیچ پەرستراوێک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێـت ، بە دڵسۆزی و ئیخلاصەوە دینداری بۆ دەکەین هەرچەندە بێباوەڕان پێیان ناخۆش بێت ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٩٦) ..

ج- هیچ پەرستراوێک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت ، تەنها و بێ هاوەڵە ، موڵک و سوپاس و ستایش تەنها بۆ ئەوە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە ، ئەی خودایە .. هیچ ڕێگرێک نییە بۆ ئەو شتەی تۆ دەیبەخشی و بەخشەر نییە بۆ ئەو شتەی تۆ دەیگریتەوە، و هیچ خاوەن سامان و دەوڵەمەندێک -سامان و دەوڵەمەندییەکەی- سوودی پێناگەیەنێ و ڕزگاری ناکا لە تۆ ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٤٤) و (موسلیم) بە ژمارە (٥٩٣) .

د- ئەمجار ئەو تەسبیحاتانە دەڵێت کە هاتوون ، وە چەند شێوازێکی هەیە.

**یەکەم :** سبحان الله (سی و سێ جار) ، والحمد لله (سی و سێ جار) ، والله أكبر (سی و سێ جار) وە بۆ تەواوکردنی سەدەکە دەڵێت : لا إله إلا الله وحده...].

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو هريرة) – ڕەزای خوای لەسەر بێت- دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (هەر کەسێک لە پاش هەموو نوێژێک سی و سێ جار تەسبیحاتی خوا بکات (واتە بڵێت: سبحان الله ) و سی و سێ جار سوپاس و ستایشی خوا بکات (واتە بڵێت : الحمد لله) و سی و سێ جار خوا بە گەورە بزانێت (واتە بڵێت : الله أكبر) جا ئەوە هەموو دەکاتە نەوەدو نۆ ، ئەمجار بۆ تەواوی سەدەکە بڵێت : (هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت، تەنها و بێ هاوەڵە ، موڵک و سوپاس و ستایش تەنها بۆ ئەوە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا



هەیە) ئەوا خوای گەورە لە تاوانەکانی خۆش دەبێت هەرچەندە بە ئەندازەی کەفی سەر دەریا بێت) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٩٧).



**دووەم :** سبحان الله (سی و سێ جار) ، والحمد لله (سی و سێ جار) ، والله أكبر (سی و چوار جار)، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (کعب بن عجره) – ڕەزای خوای لە سەر بێت – فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (چەند تەسبیحاتێکی هەیە لە پاش هەموو نوێژە فەرزەکان دەکرێت ئەو کەسەی ئەنجامی بدات یان بیڵێت هەرگیز پەشیمان نابێتەوە : سی و سێ جار (سبحان الله) و سی و سێ جار (الحمد لله) و سی و چوار جار (الله أكبر)) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٩٦) .

**سێیەم :** سبحان الله (بیست و پێنج جار) ، والحمد لله (بیست و پێنج جار) ، والله أكبر (بیست و پێنج جار) و لا اله الا الله (بیست و پێنج جار)

وە ئەم شێوازە لە (الترمذي)دا هاتووە ، لە فەرموودەی (عبدالله بن زید) – ڕەزای خوای لەسەر بێت – (الترمذي) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٤١٣) و الألباني بە (صحیح)ی داناوە (تحقیق مشكاة المصابيح ٣٠٧/١ .

**چوارەم :** سبحان الله (دە جار) ، والحمد لله (دە جار) ، والله أكبر (دە جار).

ئەم شێوازە لە (الترمذي)دا هاتووە ، لە فەرموودەی (عبدالله بن عمرو) – ڕەزای خوایان لێ بێت – (الترمذي) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٤١٠) وە الألباني بە صحیح ی داناوە (تحقیق مشكاة المصابيح ١٤٣/٢).

لە پێشدا باسی ئەو بنەمایە کرا دەربارەی ئەو پەرستنانەی بە چەند جۆرێک هاتوون ، جارێک ئەمەیان دەکرێ و جارێک ئەویتر .

سوننەت وایە کە تەسبیحات بە پەنجەکان بکرێت ، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی ئەحمەد و الترمذي ریوایەتیان کردووە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (تەسبیحات بکەن و بە پەنجەکان بیژمێرن ، چونکە ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیاریان لێدەکرێت و دێنە قسە) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٧٠٨٩) و الألباني بە (حسن)ی داناوە (صحیح الجامع ٧٥٣/٢).

**خوێندنەوەی ئایەتولکورسی .**

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو أمامة) دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (هەرکەسێک لە پاش هەموو نوێژێکی فەرز (آية الكرسي) بخوێنێت ئەوا هیچ ڕێگرێک نییە لە نێوان ئەو و چوونە بەهەشت تەنها مردن نەبێت) نەسائی ریوایەتی کردووە لە (السنن الكبرى) بە ژمارە (٩٩٢٨) وە (المنذري) بە صحیح ی داناوە لە کتێبی : الترغيب و الترهيب بە ژمارە (٢٣٧٣) وە ابن عبدالهادی (المحرر ١٩٨/١) وابن القيم (زاد المعاد ٣٠٣/١) .

**خوێندنەوەی (المعوذتين) :** ﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴾، و ﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾.

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (عقبە بن عامر) – ڕەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردم کەوا لە پاش هەموو نوێژێک (المعوذات) بخوێنم) أبوداود ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (١٥٢٥) وە الألباني فەرموویەتی (إسنادە صحیح) وابن خزیمە و ابن حبان بە صحیح یان داناوە (صحیح أبي داود ٢٥٤/٥) .

ئەمە کۆمەڵێک لە سوننەتەکانی نوێژە ، کەوا موستەحەببە نوێژخوێن ئەنجامی بدات ، وە هێشتا لە کاتی فەجرداین ، وە بۆیە ئەوانەی پێشوومان باسکرد چونکە پێویستمان پێیەتی لە هەموو نوێژێکدا –والله أعلم- .

## ط) سوننەتە لە جێ نوێژگەکەی خۆیدا دانیشێت تاوەکو ڕۆژ دەردەچێت .

لە (جابر بن سمرە) ەوە –ڕەزای خوای لەسەر بێت -  (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر نوێژی بەیانی بکردبایە ئەوا لە جێ نوێژگەکەی خۆی دادەنیشت تاوەکو خۆر بەرز دەبوویەوە) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٧٠) وە (حسناً) واتە: بەرزدەبێتەوە .



◆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((حەوت تاقم هەن خوای گەورە دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە لە ڕۆژێکدا هیچ سێبەرێک نییە تەنها سێبەری خۆی نەبێت ....(وە باسی ئەوانی کرد و لەوانە) ... وە پیاوێک دڵی پەیوەستە بە مزگەوتەکانەوە )





# زیکرەکانی بەیانیان .



کاتی زیکرەکانی بەیانیان لە دەرکەوتنی فەجرەوە دەست پێ دەکات ، جا ئەگەر بانگبێژ بانگی بەیانی دا ئەوا کاتی زیکرەکانی بەیانی دەست پێ دەکات ، گومانیشی تێدا نییە کەوا زیکرەکان قەڵایەکی قایمە بۆ بەندە لە دونیادا و گەنجینەیەکی مەزنە بۆ دوارۆژی .

## زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران ئەمانەن :

١ هەرکەسێک بڵێت : (هیچ پەرستراوێک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت ، تەنها و بێ هاوەڵە ، موڵک و سوپاس و ستایش تەنها بۆ ئەوە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە) هەرکەسێک دە جار بیڵێت کاتێ رۆژدەکاتەوە ئەوا بە هۆیەوە سەد چاکەی بۆ دەنۆسرێت ، و سەد تاوانی لەسەر دەسڕێتەوە ، وە رزگار کردنی کۆیلەیەکی بۆ دەنوسرێت ، وە ئەو رۆژە پارێزراو دەبێت تاوەکو ئێوارەی بەسەردا دێت ، وە هەرکەسێ ئەگەر ئێوارەی بەسەردا بێت –ئەگەر ئەوە بڵێت – هەمان شتی دەست دەکەوێت) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٧١٩) وە ابن باز – رەحمەتی خوای لێ بێت - سەنەدەکەی بە (حسن) داناوە .

٢ (ئێوارەمان بە سەردا هات و موڵکیش ئێوارەی بە سەردا هات بۆ خوای گەورە ، سوپاس و ستایش بۆ خوا ، هیچ پەرستراوێک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت ، پەروەردگارا .. من داوای چاکەی هەموو ئەوەی لەم شەوەدا هەیە لێت دەکەم و چاکەی ئەوەی لە پاش ئەو دێت، وە پەنات پێ دەگرم لە خراپەی ئەوەی لەم شەوەدا هەیە و خراپەی ئەوەی لە پاش ئەو دێت ، پەروەردگارا .. پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی و پەککەوتەیی و خراپەی فیززلی و لوت بەرزی و فیتنەی دونیا و سزای ناوگۆڕ) وە ئەگەر رۆژی بکردایەتەوە دەیفەرموو : (بەیانیمان بە سەردا هات و موڵکیش بەیانی بەسەردا هات بۆ خوای گەورە ، من داوای چاکەی هەموو ئەوەی لەم رۆژەدا هەیە لێت دەکەم و چاکەی ئەوەی لە پاش ئەو دێت ، وە پەنات پێ دەگرم لە خراپەی ئەوەی لەم رۆژەدا هەیە و خراپەی ئەوەی لە پاش ئەو دێت... ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٧٢٣)

٣ گەورەی دوعاکانی لێخۆشبوون بریتییە لەوەی بڵێیت : ئەی خودایە .. تۆ پەروەردگاری منی، هیچ خودایەک نییە شایستەی پەرستن بێت بە هەق تەنها تۆ نەبێت ، تۆ منت دروست کردووە و منیش بەندەی تۆم ، منیش لە سەر پەیمان و بەڵێنەکەم ماوم تا لە توانامدایە ، پەنات پێ دەگرم لە خراپەی ئەوەی کردوومە و ئەنجامم داوە ، دان دەنێم بە نیعمەتەکانت بە سەرمەوە و دان دەنێم بە تاوانەکانمدا ، لە تاوانەکانم خۆشبە ، چونکە هیچ کەسێک لە تاوانەکان خۆش نابێت تەنها تۆ نەبێت ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : هەرکەسێک -ئەم دوعایە- لە رۆژدا بڵێت و لە دڵەوە یەقینی پێی هەبێت و لەو رۆژەدا بمرێت لە پێش ئەوەی ئێوارەی بە سەردا بێت ئەوا لە ئەهلی بەهەشتە و هەرکەسێک لە شەودا بیڵێت و لە دڵەوە یەقینی پێی هەبێت و لەو شەوەدا بمرێت لە پێش ئەوەی رۆژی بە سەردا بێت ئەوا لە ئەهلی بەهەشتە). (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٣٠٦) .

٤ ئەگەر یەکێکتان رۆژی کردەوە با بڵێت : (ئەی خودایە.. بە ناوی تۆوە بەیانیمان بە سەردا هات و بە ناوی تۆوە ئێوارەمان بە سەردا هات و بەناوی تۆوە دەژین و دەمرین و زیندووبوونەوەش هەر بۆ لای تۆیە) وە ئەگەر ئێوارەی بە سەردا هات دەڵێت با بڵێت : (ئەی خودایە.. بە ناوی تۆوە ئێوارەمان بە سەردا هات و بە ناوی تۆوە بەیانیمان بە سەردا هات و بەناوی تۆوە دەژین و دەمرین و دەرئەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە).
أبو داود ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٠٦٨) و الترمذي بە ژمارە (٣٣٩١) و نەسائی لە (السنن الكبرى) بە ژمارە (٩٨٣٦) و ابن ماجە بە ژمارە (٣٨٦٨) و ابن باز – رەحمەتی خوای لێ بێت – ئیسنادەکەی بە صحیح داناوە .

٥ ئەی خودایە.. بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی ، ئەی ئەو کەسەی کە زانا و ئاگاداری پەنهان و ئاشکرای ، هیچ پەرستراوێک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆ نەبێت ، پەروەردگار و پادشای هەموو شتەکان ، پەنات پێ دەگرم لە خراپەی نەفسی خۆم ، وە پەنات پێ دەگرم لە شەیتان و داو و تەڵەکەی ، وە لەوەی کە خراپەیەک بهێنم بە سەر نەفسی خۆمدا و یان بیئاڵێنم بە موسڵمانێکدا ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ( ئەم زیکرە بڵێ ئەگەر رۆژت بەسەردا هات و ئەگەر ئێوارەت بە سەردا هات و ئەگەر چویتە سەر جێگەی خەوتنت) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٥٩٧) و أبو داود (٥٠٧٦) و الترمذي (٣٥٢٩) و نەسائی (٧٦٩٩) و ابن باز – رەحمەتی خوای لێ بێت – ئیسنادەکەی بە صحیح داناوە .

٦ هیچ بەندەیەک بەیانی هەموو رۆژێک و ئێوارەی هەموو شەوێک بڵێت : (بە ناوی ئەو خوایەی کە هیچ شتێک لە گەڵ ناوەکەی ئەودا زیان ناگەیەنێت ، نە لە زەوی و نە لە ئاسماندا ، ئەو خوایە بیسەر و زانایە ) (سێ جار ، ئەوا هیچ شتێک زیانی پێ ناگەیەنێت) ئەحمەد بە ژمارە (٤٤٦) و الترمذي بە ژمارە (١٠١٧٩) وابن ماجە (٣٨٦٩) ابن باز فەرموویەتی : (الترمذي فەرموویەتی : حسن صحيح ) ئەوەش هەر ئەوەیە کە ئەو فەرموویەتی – رەحمەتی خوای لێ بێت -

٧ هیچ بەندەیەکی موسڵمان نییە کە ڕۆژی بەسەردا دێت و ئێوارەی بەسەردا دێت سێ جار بڵێت : ڕازیم بەوەی کە (الله) پەروەردگارم بێت و ئیسلامیش دینم بێت و(محمد)یش (ﷺ) پێغەمبەرم بێت ) ئیللا حەقە کە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕازی بکات ) ئەحمەد ریوایەتی بە ژمارە (١٨٩٦٧) الترمذي بە ژمارە (٣٣٨٩) وابن ماجه بە ژمارە (٣٨٧٠) وابن باز – ڕەحمەتی خوای لێ بێت - سەنەدەکەی بە (حسن) داناوە .

٨ ئەی خودایە .. من داوای پارێزراویت لێ دەکەم لە دونیا و لە دوارۆژدا ، ئەی خودایە.. من داوای لێخۆشبوون و پارێزراویت لێدەکەم لە دین و دونیا و کەسوکار و سامانەکەمدا ، ئەی خودایە .. عەیبەکانم داپۆشە و ترس و دڵەڕاوکێم مەهێڵە ، ئەی خودایە .. بمپارێزە لە پێشمەوە و لە پاشمەوە و لە لای ڕاستمەوە و لای چەپمەوە و لە سەرەوەم ، وە پەنا بە مەزنی و گەورەییت دەگرم لە ژێرەوە پێ بکرێم). ئەحمەد لە (المسند)دا تەخریجی کردووە بە ژمارە (٤٧٨٥) و أبو داود بە ژمارە (٥٠٧٤) و نەسائی لە –الکبرى-دا بە ژمارە (١٠٤٠١) و ابن ماجه بە ژمارە (٣٨٧١) و الحاكم بە (صحيح)ی داناوە

٩ پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوا لە خراپەی دروستکراوەکانی ) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٨٩٨) الترمذي بە ژمارە (٣٤٣٧) لە فەرموودەی (أبو هريرة) ەوە – ڕەزای خوای لەسەر بێت –و ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت-سەنەدەکەی بە (حسن ) داناوە .

١٠ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر ڕۆژی بەسەردا بهاتایە دەیفەرموو : (بەیانیمان بە سەردا هات لە سەر فیترەتی ئیسلام و وشەی ئیخلاص و دینی پێغەمبەرمان محمد(ﷺ) و لەسەر میللەتی باوکمان ئیبراهیم پێغەمبەر (عليه السلام) کە لایدابوو لە ناحەقییەوە بۆ هەق ، وە لە هاوبەش دانەران نەبوو) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢١١٤٤ ، ١٥٣٦٧) وە ئەگەر ئێوارەی بەسەردا هات دەڵێت: (ئێوارەمان بەسەردا هات لە سەر فیترەتی ئیسلام....) ابن باز – ڕەحمەتی لێ بێت- سەنەدەکەی بە (صحيح) داناوە . هەموو ئەوانەی باسکرا لە نامەیەکدا هاتوون لە نوسینی شەیخ ابن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – بە ناوی (تُحفة الأخيار ببيان جملة نافعة مما ورد فى الكتاب والسُنَه من الأدعية والأذكار) بەشی زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران .

١١ (ئەی زیندووی ڕاگرو هەڵسوڕێنەری بوونەوەر .. بە بەزەییەکەت داوای فریاکەوتنت لێ دەکەم ، هەموو کارەکانم بۆ چاک بکە و تەنانەت بۆ چاوتروکانێکیش مەمدەرە دەستی نەفسەکەی خۆم) نەسائی ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٠٤٠٥) و البزَار (٢٨٢/٢) و ابن حجر و الألباني بە (حسن) یان داناوە (تەماشای : نتائج الأفكار ص١٧٧ ، و سلسله الأحاديث الصحيحة ٤٤٩/١ بكه) .

١٢ (خوای گەورەم بەسە، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها ئەو نەبێت، پەنای پێ دەگرم و هەر ئەو پەروەردگاری عەرشی مەزنە) ، حەوت جار ، ئەوا خوای گەورە لەوەی خەمباری دەکات لە کێشەی دونیا و دوارۆژ لە کۆڵی دەکاتەوە.) أبو داود ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٠٨١) لە فەرموودەی (أبو الدرداء) – ڕەزای خوای لەسەر بێت- بەڵام ڕای پەسەند ئەوەیە کە قسەی هاوەڵانە و ڕاوییەکانی جێی متمانەن ، وە حوکمی (رفع)ی هەیە هەروەکو الألباني باسی کردووە (تەماشای : السلسله بكه ٤٤٩/١١).



## سێیەم : كاتی چێشتەنگاو .



**سوننەتە لە كاتی چێشتەنگاودا بەندە نوێژی چێشتەنگاو بكات.**

### بەڵگەش لەسەر ئەوە :

أ فەرموودەكەی (أبو هريرة) – رەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت : (خۆشەویستم ڕایسپاردم بۆ سێ شت ، گرتنی ڕۆژوی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێكدا ، وە دوو ڕكات نوێژی چێشتەنگاو ، وە پێش ئەوەی بخەوم نوێژی ویتر بكەم) هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەصێتی بۆ (أبو الدرداء) كردووە –رەزای خوای لەسەر بێت- (موسلیم) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٧٢٢) هەروەها وەصێتی بۆ (أبو ذر) كردووە ، نەسائی لە (السنن الكبری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٢٧١٢) وە الألباني بە (صحيح)ی داناوە (الصحيحه ٢١٦٦) .

ب فەرموودەكەی (أبو ذر) – رەزای خوای لەسەر بێت- لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی: (هەموو جومگەیەک لە هەموو رۆژێكدا صەدەقەیەكی لەسەرە ، هەموو (سبحان الله)یەک صەدەقەیە ، هەموو (الحمد لله)یەک صەدەقەیە ، هەموو (لا اله الا الله)یەک صەدەقەیە، هەموو (الله أكبر)ێک صەدەقەیە، وە فەرمانكردن بە چاكە صەدەقەیە و نەهی كردن لە خراپە صەدەقەیە ، وە دووركاتی نوێژی چێشتەنگاو جێی هەموو ئەوانە دەگرێتەوە) (موسلیم) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٧٢٠) .

وە جومگە (السلامى) : بریتییە لەو ئێسکانەی لە یەکتر جیان .

**وە لە (صحيح مسلم)دا هاتووە لە فەرموودەی دایکە عائیشەوە - ڕەزای خوای لەسەر بێت - ڕوونکردنەوەی ئەمەی تێدایە کەوا هەموو مرۆڤێک سێ سەد و شەست جومگەی بۆ دروست کراوە، وە هەر کەسێ بە ژمارەی ئەوانە صەدەقە ئەنجام بدات ئەوا ئەو ڕۆژە ڕێ دەکات بە سەر زەویدا و نەفسی خۆی لە ئاگری دۆزەخ دوورخستوەتەوە .**

## کاتەکەی :

کاتی نوێژی چێشتەنگاو دەست پێ دەکات لە : بەرزبوونەوەی ڕۆژ بە ئەندازەی ڕمێک - واتە : پاش دەرچوون لە کاتی نەهیکراو -

وە لە پێش زەوال کۆتایی پێ دێت -واتە: پێش چوونە کاتی نوێژی نیوەڕۆ بە دە خولەک .

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (عمرو بن عنبسة) - ڕەزای خوای لەسەر بێت- (نوێژی بەیانی بکە ، ئەمجار واز لە نوێژ بهێنە کاتێ ڕۆژ دەردەچێت تاوەکو بەرز دەبێتەوە ... ئەمجار نوێژ بکە ، چونکە لەو کاتەدا فریشتەکانی ئامادەی دەبن ، تاوەکو سێبەری ڕمەکە کەم دەبێـتەوە ، ئەمجار واز لە نوێژ بهێنە ، چونکە ئەو کاتە دۆزەخ تاودەدرێت) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٣٢) .

## وە باشترین کاتەکەی :

کۆتا کاتەکەیەتی ، کاتێ کە گەرمییەکەی زۆر دەبێـتەوە.

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (زيد بن أرقم) - ڕەزای خوای لەسەر بێت - کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (نوێژی گوێڕایەڵ و ئەوابەکان کاتێ کە خۆری چێشتەنگاو گەرم دەبێت) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٤٨) .

ابن باز - ڕەحمەتی خوای لێ بێت - دەفەرموێت : مانای (ترمض) واتە : گەرمای خۆرەکەی لەسەر توند دەبێت ، وە (الفصال) واتە: بەچکە وشتر ، ئەویش لەو نوێژانەیە کە لە کۆتا کاتیدا بکرێت چاکترە (تەماشای : فتاوى إسلامية بکە ١/٥١٥) .

## ژمارەی ڕکاتەکانی :

کەمترین ڕکاتی نوێژی چێشتەنگاو : دوو ڕکاتە ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو هريرة) - ڕەزای خوای لەسەر بێت - کە لە هەردوو (صحيح)دا هاتووە : (خۆشەویستەکەم بە سێ شت وەصێتی پێ کردووەم ، - تێیدا هاتووە - وە دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (١٩٨١) و (موسلیم) بە ژمارە (٧٢١) .



- بەڵام زۆرترین رکاتەکانی نوێژی چێشتەنگاو لەسەر رای راست و دروست : بۆ زۆرترینەکەی سنووری نییە ، بە جیاواز لە گەڵ ئەو کەسانەی بە هەشت رکات سنوورداریان کردووە ، جا بۆی هەیە لەو هەشت رکاتە زیاتر بکات تا دەتوانێت ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی دایکە عائیشە – رەزای خوای لەسەر بێت – فەرموویەتی : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوار رکات نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد ، ئەمجار تا ویستی خوای لەسەر بوایە نوێژی دەکرد) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧١٩) .

◆ لەبەر گەورەیی فەزڵی نوێژی چێشتەنگاو پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەێتی دەکردە هاوەڵانی کە دەستی پێوە بگرن

## چوارەم : کاتی نیوەڕۆ.



### چەند کارێکی تیادایە :

**کاری یەکەم : نوێژە سوننەتەکانی پێش و پاشی نوێژی نیوەڕۆ .**

لە پێشدا باسی سوننەتە راتیبەکانمان کرد ، کەوا لە شەرعدا هاتووە پێش نیوەڕۆ چوار رکات بکرێت، وە لە پاشی دوو رکات، هەروەکو فەرموودەکەی دایکە عائیشەو أم حبيبة و ابن عمر دەلالەتی لەسەر دەکەن – رەزای خوا لەسەر هەموویان بێت - .

**کاری دووەم : سوننەتە رکاتی یەکەم لە نوێژی نیوەڕۆ درێژبکرێتەوە .**

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو سعيد الخدري) – رەزای خوای لەسەر بێت- دەفەرموێت : (نوێژی نیوەڕۆ – لە کاتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)- دەبەسترا ، کەسێک دەرۆیشت بۆ بەقیع ، و لەوێ سەرئاوی دەکرد ئەمجار دەستنوێژی دەشوشت ، ئەمجار دەهاتەوە کەچی هێشتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە رکاتی یەکەمدا بوو ، لەبەر ئەوەی هێندە درێژی دەکردەوە) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٥٤) .



جا سوننەتە ئیمام رکاتی یەکەم درێژبکاتەوە لە نیوەرۆدا ، هەروەها کەسی تاکیش ، هەروەها ئافرەتیش لە نوێژی نیوەرۆدا ، ئەمەش لە سوننەتە بزرکراوەکانە ، داوا لە خوای گەورە دەکەین بە جێبەجێ کردنی سوننەت بە شێوەیەکی تەواو و سووربوون لەسەری .

**کاری سێیەم : لە کاتی سەختی گەرمادا ، سوننەتە نوێژی نێوەڕۆ دوابخرێت تاوەکو خۆرەکە دەشکێتەوە .**

بەڵگەش لەسەر ئەوە :

فەرموودەکەی (أبو هريرة)یە – رەزای خوای لەسەر بێت- لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) : (کاتێک گەرما بەتین و زۆر بوو ئەوا نوێژەکانتان بخەنە کاتی فێنکی ، چونکە توندی گەرما لە هەڵاوی دۆزەخە))

فيح جهنم : بریتییە لە کوڵانی دۆزەخ و بڵاو بوونەوەی بڵێسە و گڕەکەی . (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٣٣، ٥٣٤) و(موسلیم) بە ژمارە (٦١٥) .

مامۆستامان ابن عثيمين –رەحمەتی خوای لێبێت- دەفەرموێت : ئەگەر وایدانێین بۆ نمونە لە رۆژانی هاویندا لە کاتژمێر دوازدە رۆژ زەوال دەبێت ، وە نوێژی عەسر لە کاتژمێر چوار و نیو دەبێت، ئەوا ئەو کاتە ساردکردنەوە تا نزیکەی کاتژمێر چوار دەبێت ( تەماشای : الممتع بكه (١٠٤/٢).

(سارکردنەوە : واتە نوێژەکەیان لە کاتی فێنکیدا بکەن)

ساردکردنەوە گشتییە بۆ ئەوانەی بە جەماعەت نوێژ دەکەن و بۆ ئەوانەی بە تەنها نوێژ دەکەن لەسەر رای راست ودروست ، هەر ئەمەش مامۆستامان (ابن عثيمين) هەڵیبژاردووە ، بەم پێیە هەروەها ئافرەتانیش دەگرێتەوە ، بۆیە ساردکردنەوە بۆیان سوننەتە لە کاتی سەختی گەرمادا ، بە بەڵگەی گشتگیری فەرموودەکەی (أبو هريرة) -رەزای خوای لەسەر بێت -

## پێنجەم : کاتی عەسر.




لە پێشدا باسی سوننەتە راتیبەکانمان کرد و روونمان کردەوە، وە لە پێش نوێژی عەسر هیچ راتیبەیەک نییە .

شیخ الاسلام ابن تیمیە –رەحمەتی خوای لەسەر بێت- دەفەرموێت : بەڵام لە پێش نوێژی عەسر، هیچ کەسێک نەیفەرمووە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پێش عەسر نوێژی کردبێت ، ئیللا (ضعف) تێدایە ، بەڵکو هەڵەیە)) تەماشای : الفتاوی بکە (١٢٥/٢٣) .

جا رای راست و دروست – والله أعلم- ئەوەیە : **سوننەتێکی دیاریکراو لە پێش عەسر نییە ، ئەمجار کارەکە بە رەهایی دەمێنێتەوە هەرکەسێ ویستی لێبێت دوو رکات بکات ئەوا دەیکات ، یان زیاتر لە رووی (تطوع) ی رەهاوە ، هەروەکو چۆن لە کاتەکانی تردا نوێژ دەکات جگە لە کاتە نەهی لێکراوەکان ئەوا بۆی هەیە ، بەڵام شتێکی تایبەت بە عەسرەوە ئەوا نییە .**

## زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران .

کاتی زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران کەی دەست پێدەکات .

### کاتی زیکرەکانی بەیانیان :

لە دەرکەوتنی فەجری راستگۆوە دەست پێدەکات کە ئەویش کاتی نوێژی بەیانییە ، جا ئەگەر بانگبێژ بانگی دا بۆ نوێژی بەیانی ئەوا ئەو کاتە کاتی زیکرەکانی بەیانیان دەست پێدەکات ، ئەمەش قسەی کۆی زانایانە –رەحمەتی خوایان لێ بێت – وە ئاساییە لە پاش دەرکەوتنی خۆر بیڵێت ، بە تایبەت ئەگەر بە هۆی بیانوویەکەوە وازی لێهێنا ، وە چونکە لە پاش دەرکەوتنی رۆژیش هەر پێی دەڵێن بەیانی ، هەروەها چونکە فەزڵ و بەرەکەتی زیکری دەست دەکەوێت ، ئەمەش باشترە لە وازهێنانی و بێ ئاگابوون لێی لە ئەودوای رۆژەکەی .

### کاتی زیکرەکانی ئێواران :

**ئەوەی دیارترو روونترە – والله أعلم- : لە پاش نوێژی عەسرەوە دەست پێدەکات تاوەکو رۆژ ئاوابوون ، ئاساییە لە پاش رۆژئاوابوونیش بیڵێت ، بە تایبەت ئەگەر بە هۆی بیانوویەکەوە وازی لێهێنا، وە چونکە لە پاش رۆژئاوابوونیش هەر پێی دەڵێن ئێوارە ، هەروەها چونکە فەزڵ و بەرەکەتی زیکری دەست دەکەوێت ، ئەمەش باشترە لە وازهێنانی و بێ ئاگابوون لێی لە ئەودوای شەوەکەی .**

**پرسیار کرا لە مامۆستامان (ابن عثيمين) – رەحمەتی خوای لێ بێت- : کەی کاتی زیکرەکانی ئێوارەیە؟ وە باشترین کاتی کامەیە ؟ وە ئایە بە قەزا دەدرێتەوە لە کاتی لەبیر چووندا ؟.**

وەڵام : سوپاس و ستایش بۆ خوا ، ئێوارە فراوانە لە پاش نوێژی عەسەرەوە تاوەکو نوێژی خەوتنان هەمووی پێی دەڵێن : ئێوارە ، جا ئەگەر لەسەرەتاوە وتی یان لە کۆتاییدا ، ئیللا ئەوانە نەبێت کە تایبەت کراون بە شەو وەکو ئایەتولکورسی بە شەو دەیخوێنێ ، جا ئەوەی پەیوەست کراوە بە شەووەوە ئەوا شەوە، وە ئەوەی پەیوەست کراوە بە رۆژ پێی دەڵێن : رۆژ ، بەڵام بە قەزا دانەوەی ئەگەر لەبیری چوو ئەوا تکام وایە پاداشتی لەسەر بدرێتەوە) تەماشای (فتاوى الشيخ ابن عثيمين لمجلة الدعوة) بکە ژمارە (١٧٤) ١٤٢١/٢/٧ هـ ص (٣٦) هەروەها تەماشای : شەرحی (رياض الصالحين) بکە (١٥٣٣/٢) بەشی : (الذكر عند الصباح و المساء) .





## شەشەم : کاتی مەغریب



چەند کارێکی تێدایە :



**کاری یەکەم : رێگری کردن لە منداڵان لەسەرەتای مەغریبەوە یەکێکە لە سوننەتەکان.**



**کاری دووەم : سوننەتە لە سەرەتای مەغریبەوە دەرگاکان دابخرێت ، وە ناوی خوا بهێنرێت .**

وە لە ئەنجامدانی ئەم دوو ئەدەبەدا پارێزگاری تێدایە لە شەیتان و جنۆکە ، جا لە رێگری کردن لە منداڵان لە سەرەتای مەغریبدا پارێزگاری ئەوانی تێدایە لە شەیتانەکان کە لەو کاتەدا بڵاو دەبنەوە، هەروەها لە داخستنی دەرگاکان و ناوی خوا هێنان لە کاتی داخستنیدا ، چەندین منداڵ لەم کاتەدا شەیتان زەفەری پێ گەیاندووە ، کەوابوو ببینە ئیسلام چەند مەزنە لە پارێزگاری کردنی منداڵ و ماڵەکانماندا!



بەڵگەش لەسەری :فەرموودەکەی (جابر بن عبدالله) – ڕەزای خوایان لەسەر بێت- دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر شەو بەسەردا هات- یان ئێوارەتان بەسەردا هات- ئەوا ڕێگری بکەن لە منداڵەکانتان ، چونکە شەیتان لەو کاتەدا بڵاو دەبێتەوە ، وە ئەگەر سەعاتێکی شەو ڕۆیشت ئەوا لێیان گەڕێن و دەرگاکان داخەن و ناوی خوا بهێنن، چونکە شەیتان ناتوانێت دەرگای داخراو بکاتەوە) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٣٠٤) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٠١٢) . وە (جنح اللیل) : هاتنی شەوە لە پاش ڕۆژئاوابوون .

وە ڕێگری کردن لە منداڵان و داخستنی دەرگاکان لەسەرەتای مەغریبەوە ئەوا لە باس و بابەتی ئیستیحبابە ، تەماشای : (فتاوی اللجنة الدائمة (٣١٧/٢٦) بکە.

## اکاری سێیەم : دوو ڕکات نوێژ پێش مەغریب.

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (عبدالله بن مُغَفَل المزني ) – ڕەزای خوای لەسەر بێت – کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (لە پێش نوێژی مەغریب نوێژ بکەن ، وە لە جاری سێیەمدا فەرمووی – بۆ هەرکەسێ ویستی لەسەر بێت ، لە ترسی ئەوەی نەوەک خەڵکی بیکاتە سوننەتێک).

(بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (١١٨٣) .

– هەروەها سوننەتە دوو ڕکات نوێژ ئەنجام بدرێت لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا .

جا ئیتر ئەگەر هاتوو ئەم دوو ڕکاتە ڕاتیبە بێت وەکو بەیانی ونیوەڕۆ ، ئەوا بە ئەنجامدانی ئەو دوو ڕکاتە جێی ئەوە دەگرێتەوە ، یان وەکو ئەوەی لە مزگەوت دانیشتبێت ئەمجار بانگبێژ بانگی دا بۆ عەسر یان بۆ خەوتنان ئەوا سوننەتە هەڵسێت و دوو ڕکات نوێژ بکات .

بەڵگەش لەسەری : فەرموودەکەی (عبدالله بن مُغَفَل المزني ) – ڕەزای خوای لەسەر بێت – کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (لە نێوان هەموو دوو بانگدا نوێژ هەیە) سێ جار فەرمووی ، وە لە جاری سێیەمدا فەرمووی : بۆ هەرکەسێ ویستی لێ بێت) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٢٤) و(موسلیم) بە ژمارە (٨٣٨) .

گومانی تێدا نییە کەوا دوو ڕکاتەکەی پێش مەغریب ، یان لە نێوان بانگ و قامەتدا سوننەتێکی (مؤكدة) نین وەکو دووپاتکردنەوەی سوننەتە ڕاتیبەکان ، بەڵکو هەندێ جار وازی لێ دەهێنرێت ، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سێیەم جاردا فەرمووی : (بۆ هەرکەسێ ویستی لێ بێت) نەوەک خەڵکی بیکەنە سوننەتێک .



### کاری چوارەم : خەوتن مەکروهە لە پێش عیشا .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبي برزة الاسلمی) - رەزای خوای لەسەر بێت - کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) : (پێی خۆش بوو نوێژی خەوتنان دوا بخات ، فەرمووی : وە خەوتنی پێ ناخۆش بوو پێش نوێژی خەوتنان و قسەکردنیش لە دوایەوە). (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٩٩) و (موسلیم) بە ژمارە (٦٤٧) .

وە هۆکاری کەراهەتی خەوتن لە کاتی مەغریبدا ، واتە : پێش عیشا ، چونکە ئەو خەوتنە هۆی لە دەستدانی نوێژی عیشای تێدایە .

◆ تەوبەکردن لە رۆژ و شەودا کلیلێکە بۆ بەندە و هەروەها راستکردنەوەی رۆیشتنی بەرە و لای خوای تێدایە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (خوای گەورە شەوانە دەستەکانی فراوان دەکاتەوە بۆ ئەوەی لە تاوانکاری رۆژ خۆش بێت وە رۆژانە دەستەکانی فراوان دەکاتەوە بۆ ئەوەی لە تاوانکاری شەو خۆش بێت))

## حەوتەم : کاتی عیشا .



**چەند کارێکی تێدایە :**

### کاری یەکەم : دانیشتن و قسەکردن مەکروهە لە پاشی .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (ابی برزه الاسلمی) - رەزای خوای لەسەر بێت - پێشوو ، تێدا هاتووە : (وە خەوتنی پێ ناخۆش بوو پێش نوێژی خەوتنان و قسەکردنیش لە دوایەوە) ، بەڵام ئەگەر قسەکردنەکەی لەبەر پێویستییەک بوو ئەوا کەراهەتی تێدا نییە .

وە هۆی کەراهەتەکە - والله أعلم- : خەوەکەی دوادەکەوێت ، ترسی ئەوە هەیە کە نوێژی بەیانی لە دەست دەرچێت ، یان لە سەرەتای کاتەکەی ، یان شەونوێژەکەی بۆ کەسێک لەسەری را هاتووە .

### کاری دووەم : باشتر وایە نوێژی عیشا دوابخرێت ، ئەگەر بەو کارەی نارەحەتی لەسەر مەئمومەکان نەبێت .

**بەڵگەش لەسەر ئەوە :**

فەرموودەکەی دایکە عائیشە – ڕەزای خوای لەسەر بێت – فەرموویەتی : شەوێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) مایەوە ، تاوەکو زۆربەی شەو ڕۆیشت ، وە تاوەکو ئەوانەی مزگەوت خەوتن ئەمجار پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرچوو نوێژی کرد ، فەرمووی : (بە ڕاستی ئەمە کاتەکەیەتی ، ئەگەر نەبوایەتە هۆی نارەحەتی و مەشەقەت بۆ ئوممەتەکەم) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٣٨).

بەم پێیە سوننەت وایە بۆ ئافرەتان کە پەیوەست نین بە جەماعەتەوە نوێژی عیشا دوابخەن ئەگەر نەبێتە نارِەحەتی بۆیان ، هەروەها ئەو پیاوەی کە پەیوەست نییە بە جەماعەتەوە وەکو ئەوەی لە ڕێگای سەفەر بێت و یان نمونەی ئەوانە .

## سوننەتە هەموو شەوێک سورەتی (الإخلاص) بخوێنێت .

لە (أبو الدردا و)ەوە هاتووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ، فەرموویەتی : (ئایە کەسێکتان ناتوانێ لە شەوێکدا سێ یەکی قورئان بخوێنێت؟ وتیان : ئایە چۆن سێیەکی قورئان دەخوێنێ ؟ فەرمووی : (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ) بەرانبەر بە سێ یەکی قورئانە). (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٨١١) و (بوخاری) بە ژمارە (٥٠١٥) لە فەرموودەی (أبو سعید)ەوە – ڕەزای خوای لێ بێت -



# سوننەتەكانی خەوتن .

**خەوتن ، چەند سوننەتێكی تێدایە :**

## ١ داخستنی دەرگاكان لە كاتی خەوتندا .



بە بەڵگەی فەرموودەكەی (جابر) - ڕەزای خوای لێ بێت - فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر ئێوە خەوتن چراكان بكوژێننەوە و دەرگاكان داخەن و دەمی كونەكان ببەستن و خواردن و خورادنەوەكان داپۆشن) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٥٦٢٤) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٠١٢) .

وە هۆكاری فەرمانكردن بە داخستنی دەرگاكان : ڕێگری كردنە لە شەیتانەكان بۆ هاتنە ژوورەوە ، هەروەكو لە پێشدا باسمان كرد لە فەرموودەكەی تری (جابر) - ڕەزای خوای لەسەربێت -.

(وە دەرگاكان داخەن و ناوی خوا بهێنن ، چونكە شەیتان ناتوانێت دەرگای داخراو بكاتەوە) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٥٦٢٣) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٠١٢)

## ٢ كوژاندنەوەی ئاگر پێش خەوتن



بە بەڵگەی فەرموودەكەی (جابر) ی پێشوو- ڕەزای خوای لەسەر بێت- وە تێیدا هاتووە : (ئەگەر ئێوە خەوتن چراكان بكوژێننەوە).

هەروەها فەرموودەكەی (ابن عمر)- ڕەزای خوای لەسەر بێت - پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (كاتێ خەوتن ئەوا ئاگر بە جێ مەهێڵن لە ماڵەكانتاندا) (موسلیم) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٢٠١٥)

بەم پێیە هەموو شتێكی لەسەر دەكرێتە قیاس كە ببێتە هۆی بەرپابوونی ئاگر بۆ ماڵەكە ، بۆ نمونە ئاگادارای ئەو شتانە دەبین كە ڕەنگە كاریگەریان هەبێت وەكو هۆكارەكانی گەرم كردن بە هۆی ئەوەی شتەكان نزیكی بێت ، بۆیە دەبێتـە هۆكاری ئاگركەوتنەوە و نمونەی ئەوانە ، چونكە هۆكارەكە یەكە ، وە ئاگریش دوژمنە هەروەكو پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێداوین .

بەم پێیە : ئەگەر كەسی خەوتوو تەمین بوو لەم ئاگرە ، وە كاریگەری نابێت ، وەكو ئەوەی هیچ شتێك نەبێت لە دەوروبەری ببێتە هۆی بڵاو بوونەوەی ، ئەوا ئەو كاتە هێشتنەوەی ئاساییە ، چونكە حوكمەكە لە گەڵ هۆكارەكەیدا دەسوڕێتەوە بە بوون و نەبوون .



## ٣ دەستنوێژ شوشتن پێش خەوتن.



به بەڵگەی فەرموودەکەی (البراء بن عازب) – رەزای خوای لەسەر بێت- کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر چوویتە سەر جێگەی نوستنت ئەوا دەستنوێژ بشۆرە هەروەکو چۆن دەستنوێژ بۆ نوێژ دەشۆریت و ئەمجار لە سەر لای راستت راکشێ و بلێ : (( ئەی خودایە .. ئەوا من رووی خۆمت تەسلیم دەکەم ....) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٤٧) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٧١٠) .

## ٤ تەکاندنی جێگاکە پێش ئەوەی لەسەری راکشێت .



به بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو هريرة) -رەزای خوای لەسەر بێت – فەرموویەتی : (ئەگەر یەکێکتان چوونە سەر جێگای خەوتنەکەی ئـەوا با بەشی نـاوەوەی ئیزارەکەی جێگەکەی بتەکێنێ ، چونکە نازانێ لە پاش ئەو چی رۆیشتووتە سەر و ئەمجار با بڵێت : بە ناوی تۆوە ئەی پەروەردگارا.. تەنیشتم دادەنێم) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٣٢٠) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٧١٤) .

وە (داخلە الأزار) : لای ناوەوەی کە دەدا لە جەستە.

جا بە پێی ئەوەی باسکرا ، سوننەت ئەوەیە کەوا جێگاکەی دەتەکێنێ و تەکاندنەکە سێ جار دەبێت و ناوی خوا دەهێنێ لە کاتی تەکاندنەکەدا.

وە باشتر وایە تەکاندنەکە بە بەشی ناوەوەی پۆشاکەکەی بێت ، وە هەندێ لە زانایان دەفەرموون بە هەر شتێک بێت ، گرنگترین شت ئەوەیە کەوا جێگاکە بتەکێنێ ، لەوانە (الشيخ ابن جبرين) – رەحمەتی خوای لێ بێت – فەرموویەتی : مەرج نییە بە کارهێنانی دیوی ناوەوەی ئیزارەکە ، بەڵکو ئەگەر هەموو جێگاکەی تەکاند یان بە عەمامەکەی ونمونەی ئەوانە تەکاندی ئەوا مەبەستەکەی پێکاوە ) تەماشای فەتواکەی بکە بە ژمارە (٢٦٩٣) .

## ٥ خەوتن لەسەر لای راست .

### ٦ دەستی ڕاستی بخاتە ژێر گۆنای ڕاستی.



بەڵگە لە سەر ئەم دوو سوننەتە : فەرموودەكەی (البراء بن عازب ) – ڕەزای خوای لەسەر بێت – كەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر چوویتە سەر جێگەی نوستنت ئەوا دەستنوێژ بشۆرە هەروەكو چۆن دەستنوێژ بۆ نوێژ دەشۆریت و ئەمجار لە سەر لای ڕاستت ڕاكشێ و بڵێ : (( ئەی خودایە .. ئەوا من ڕووی خۆمت تەسلیم دەكەم....) (بوخاری) ڕیوایەتی كردووە بە ژمارە (٢٧١٠) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٤٧) .

وە فەرموودەكەی (حذیفة) – ڕەزای خوای لەسەربێت – فەرموویەتی : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر بە شەو بیویستایە بخەوتایە ئەوا دەستی ڕاستی دەخستە ژێر گۆنای ....) (بوخاری) ڕیوایەتی كردووە بە ژمارە (٦٣١٤) .



### ٧ خوێندنەوەی زیكرەكانی خەوتن :

وە خەوتن چەند زیكرێكی هەیە لە كیتاب و سوننە :

#### ١ ئەوەی لە قورئاندا هاتووە :

#### أ خوێندنەوەی ئایەتولكورسی.

خوێندنەوەی ئایەتولكورسی لە كاتی خەوتندا سوننەتە ، چونكە دەیپارێزێت لە شەیتان تا ڕۆژدەكاتەوە .

بەڵگەش لەسەر ئەوە : چیرۆكەكەی (أبو هريرة)یە – ڕەزای خوای لێ بێت- لە گەڵ ئەو كەسەی زەكاتی دەدزی، وە لەفەرموودەكەدا هاتووە (أبو هريرة) فەرمووی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وتم : دوێنێ ئەسیرەكەت چی كرد ؟ وتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ وتم كە گوایە چەند وشەیەكم فێر دەكات كە سوودی بۆم دەبێت لە لایەن خواوە ، بۆیە منیش ئازادم كرد ، دەڵێت : ئەوە چییە ؟ وتم : پێی وتم ئەگەر چویتە سەر جێگای خەوتنت ئەوا ئایەتولكورسی بخوێنە لە سەرەتاكەیەوە تاوەكو ئایەتەكە تەواو دەكەیت ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾ وە پێی وتم : بەردەوام لە لایەن خواوە پارێزەرێكت بۆ هەیە و شەیتان نزیكت ناكەوێتەوە تاوەكو ڕۆژ دەكەیتەوە ، وە ئەوانیش سوور بوون لە سەر خەیر، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : بەڵام ئەو ڕاستی لە گەڵ تۆدا كرد و كەچی خۆیشی درۆزنە ، ئایە دەزانی سێ شەوە لە گەڵ كێدا دەدوێیت ، ئەی ئەبو هورەیرە؟ وتم : نەخێر ، فەرمووی : ئەوە شەیتان بوو) (بوخاری) ڕیوایەتی كردووە بە (معلق) ی بە ژمارە (٢٣١١) وە نەسائی سەنەدەكەی گەیاندووە لە (السنن الكبرى) بە ژمارە (١٠٧٩٥).

### ب> خوێندنەوەی دوو ئایەتەکەی کۆتایی سورەتی (البقرة).

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو مسعود الانصاری) – رەزای خوای لێ بێت – فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (هەرکەسێک شەوانە ئەم دوو ئایەتەی کۆتایی سورەتی (البقرة) بخوێنێ ئەوا بەسیەتی) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٠٠٨) و(موسلیم) بە ژمارە (٨٠٧) . وە دوو ئایەتەکەی کۆتایی سورەتی (البقرة) لە زیکرەکانی خەوتن نین بە تایبەت ، بەڵکو زیکرێکە بە شەو دەگوترێت ، جا هەرکەسێ بە شەو نەیخوێند ، وە لە کاتی خەوتندا کەوتە بیری ، ئەوا با ئەو کات بیخوێنێت .

وە زانایان جیاوازن لە مانای وشەی (کفتاة):

دەڵێن : جێی شەونوێژی بۆ دەگرێتەوە)، وە دەڵێن : لە شەیتان دەیپارێزێ.

وە دەڵێن : لە بەڵاو و نەهامەتی دەیپارێزی ، وە رەنگە هەموو ئەوانە بگرێتەوە هەروەکو نەوەوی فەرموویەتی (تەماشای : شرح النووی لمسلم) بکە ، فەرموودەی (٨٠٨) بەشی (فضل الفاتحة وخواتیم سوره البقرة ...)

### ج> خوێندنەوەی سورەتی (الاخلاص ، المعوذتین ، فووکردن بە دەستدا لە پاش خوێندنەوەی ، ئەمجار سڕینی جەستەی سێ جار .

**وە بەڵگەش لەسەری :**

فەرموودەکەی دایکە عائیشە – رەزای خوای لەسەر بێت- : (ئەگەر هەموو شەوێک بچوایەتە سەر

جێگەکەی ئەوا هەردوو دەستی کۆ دەکردەوە و ئەمجار فووی پیادەکردن و ئەم سورەتانەی دەخوێندەوە:

﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ و﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ ئەمجار ئەوەی لە توانایدا بوایە جەستەی خۆی پێ دەسڕین ، سەرەتا لە سەر و دەموچاو و پێشەوەی جەستەی دەستی پێدەکرد ، ئەم کارەی سێ جار ئەنجام دەدا ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٠١٧) .

سوودە بە دەست هاتووەکانی فەرموودەکەی پێشوو : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم سوننەتەی هەموو شەوێک جێ بەجێ دەکرد ، بە بەڵگەی قسەکەی دایکە عائیشە : (کل لیلة) وە هەرکەسێک ویستی ئەم سوننەتە جێ بە جێ بکات ئەوا هەردوو دەستی کۆ دەکاتەوە و ئەمجار فووی پێدا دەکات لە گەڵ وتنی (الاخلاص و المعوذتین) ، ئەمجار ئەوەی بتوانێت بە دەستەکانی جەستەی دەسڕێت ، لە سەر و دەموچاوییەوە دەست پێ دەکات ، ئەم کارە سێ جار دووبارە دەکاتەوە.

### د> خوێندنەوەی سورەتی الکافرون .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (عروە بن نوفل) لە باوکییەوە – رەزای خوای لەسەر بێت – کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (نوفل)ی فەرمووە : (فەرمووی : ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ بخوێنە چونکە ئەوە دەبێتە مایەی

پاكانە و سەرفەرازبوون (بەرائەت) لە هاوەڵ بریاردان (شیرک))

ئەحمەد ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٢١٩٣٤) و أبوداود بە ژمارە (٥٠٥٥) و الترمذي بە ژمارە (٣٤٠٣) و الألباني – رەحمەتی خوای لێ بێت- بە (حسن)ی داناوە .

## ٢ وە لە سونەتدا چەند دوعایەک هەیە : لەوانە :



أ **(ئـەی خـودایـە.. بە نـاوی تـۆوە دەمـرم و دەژیم) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٦٣٢٤) لە فەرموودەی (حذيفة)وە – رەزای خوای لەسەر بێت -.**

ب (ئەی خودایە.. تۆ نەفسەكەی منت دروست كردووە و هەر تۆ دەیمرێنیت ، مردن و ژیانی تەنها بۆ تۆیە ، ئەگەر ژیانتەوە (زیندووت كردەوە) ئەوا بیپارێزە و ئەگەر مراندت ئەوا لێی خۆشبە ، ئەی خودایە.. من داوای لەشساغیت لێ دەكەم ) (موسلیم) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٢٧١٢) .

ج (ئەی خودایە .. هەر تۆ پەروەردگاری ئاسمانەكان و پەروەردگاری زەویت و پەروەردگاری عەرشی مەزنی ، پەروەردگاری ئێمە و پەروەردگاری هەموو شتێكیت ، هەر تۆ تەقێنەری هەموو دانەوێڵە و تۆوێكیت ، دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئانی ، پەنات پێدەگرم لە خراپەی هەموو خراپەكارێک كە ناوچەوانی بە دەستی تۆیە ، ئەی خودایە.. تۆ یەكەم كەسێكیت و هیچ كەسێک لە پێش تۆ نەبووە و تۆ دوایین كەسێكیت و هیچ كەسێک لە پاش تۆ نییە ، تۆ خاوەن دەسەڵات و شكۆمەندی و هیچ كەسێک لە سەرووی تۆوە نییە ، هەر تۆ پەنهانی و جگە لە تۆ كەس لە وردەكارییەكان ئاگادار نییە ، قەرزەكانمان لە سەر هەڵگرە و دەوڵەمەندمان بكە لە هەژاری) (موسلیم) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٢٧١٣)

د (بە ناوی تۆوە ئەی پەروەردگارا ... تەنیشتم دادەنێم و هەر بەناوی تۆوە بەرزی دەكەمەوە، ئەگەر نەفسەكەمت گرتەوە ئەوا بەزەییت پێیدا بێتەوە و ئەگەر ناردتەوە ئەوا بیپارێزە بەوەی كە بەندە چاكەكارەكانی خۆت دەپارێزێت) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٦٣٠٢) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٧١٤) .

هـ (سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە تێری كردین و تێر ئاوی كردین و پێویستی نەخستینە دەستی جگە لە خۆی (تەنها ئەو بەسمانە) و داڵدەی داین، چەندەها كەس هەن كە خوا بە بەس نازانن و داڵدەیان نییە) .



لە فەرموودەی (أنس)ەوە – ڕەزای خوای لەسەر بێت – فەرموویەتی : (ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بچوایەتە سەر جێگاکەی خۆی دەیفەرموو : ( سوپاس و ستایش بۆ خوا ...) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٧١٥) .

و ( (ئەی خودایە .. لە سزاکەت بمپارێزە لەو ڕۆژەی کە بەندەکانتی تێدا زیندوو دەکەیتەوە ) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٨٦٦٠) وە الألباني بە (صحیح) ی داناوە (صحیح الجامع ٨٦٩/٢)

ز ( وتنی (سبحان الله) و (الحمد لله) سی وسێ جار و (الله أکبر) سی و چوار جار .

لە سوننەتدا هاتووە ئەگەر ویستی بخەوێت ئەوا سی وسێ جار (سبحان الله) سی و سێ جار (الحمدلله) و سی وچوار جار (الله أکبر) بکات ، چونکە ئەمە فەزڵێکی گەورەی هەیە ، ئەویش : لە ڕۆژەکەیدا هێزی جەستەی پێ ببەخشێت .

بەڵگەش لەسەر ئەمە : فەرموودەکەی (عەلی)یە – ڕەزای خوای لە سەر بێت - : (کەوا –فاطمە- شکایەتی حاڵی خۆی کرد بە هۆی ئەوەی دەستەکانی تووشی دەبێت بە هۆی بە کارهێنانی دەساڕەوە ، چەند کەنیزەکێکیان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێنا بوو ، ئەویش چوو بۆ لای باوکی کەچی نەیبینی ، بە دایکە عائیشە گەیشت و هەواڵەکەی پێ گوت ، کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕایەوە ، دایکە عائیشە هەواڵی پێدا بە هاتنی (فاطمە) بۆ لای ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ لامان ، لە کاتێکدا ئێمە چووبوینە ناو جێگەی خۆمانەوە ، ویستمان هەڵسین ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : لە جێگای خۆتان بمێننەوە، ئەمجار لە نێوانماندا دانیشت تاکو هەستم بە ساردی پێی کرد لەسەر سینگم ، ئەمجار فەرمووی: ئایە شتێکتان فێر بکەم باشتر بێت لەوەی داواتان کردبوو؟ ئەگەر چوونە سەر جێگاکەتان ئەوا سی و چوار جار بڵێن (الله أکبر) وسی و سێ جار بڵێن (سبحان الله) و سی و سێ جار بڵێن (الحمد لله) ، جا ئەوە باشترە بۆتان لە خزمەتکار) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٧٠٥) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٧٢٧) .

وە لەریوایەتێکی تردا : عەلی فەرمووی : (لەو کاتەوە لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە وازم لێ نەهێناوە ، پێیان وت : تەنانەت شەوی (صفین)ش ؟ فەرمووی : تەنانەت شەوی (صفین)ش) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٣٦٢) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٧٢٧) .

ح ( (ئەی خودایە .. ئەوا من نەفسی خۆمت تەسلیم دەکەم ، ڕووم کردە تۆ و هەموو کارێکم دا بە دەستی تۆ و پشتم بە تۆ بەست ، بە خواستی خۆم و لە ترسی تۆدا ، هیچ ڕزگاربوونێک و حەشارگە و پەناگەیەک نییە لە تۆ مەگەر تەنها بۆ لای تۆ نەبێت ، باوەڕم هێنا بە کتێبەکەت کە دادبەزاندووە و بە پێغەمبەرەکەت (ﷺ) کە ڕەوانەت کردووە)

(بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٤٧) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٧١٠) ... وە لە کۆتایی فەرموودەکەدا هاتووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (ئەوانەش بکە دوا قسەکانت ، جا ئەگەر ئەو شەوە بمریت ئەوا لە سەر فیترەت مردووی) وە لە ریوایەتێکی تردا کە لە (موسلیم) دا هاتووە : (وە ئەگەر ڕۆژت کردەوە ئەوا لە سەر خەیر ڕۆژ دەکەیتەوە) .

وە لەم فەرموودەیەدا روونکردنەوەی سوننەتێکی تری تێدایە ، ئەویش : ئەم زیکرە بکاتە دوا قسەکردنی لە پێش خەوتنی ، وە پاداشتێکی گەورەی تێدایە بۆ کەسێک قەدەری وا بوو لەو شەوەدا بمرێت ، ئەوا دەبێتە یەکێک لەو کەسانەی لەسەر فیترەت دەمرن ، واتە : ئەو لە سەر میللەتە پاکەکەی ئیبراهیم مردووە کە لە شیرکەوە لایدابوو بۆ تەوحید ، وە ئەگەر رۆژی کردەوە ئەوا رۆژ دەکاتەوە لەسەر خەیر و چاکە لە ریزق و کرداریدا ، ئەمیش وشەیەکی گشتگیرە هەموو ئەوانەی پێشوو وجگە لەوانەش دەگرێتەوە – والله أعلم-



◆ زیکر قەڵای تۆکمەیە ، وە هۆکارە بۆ ژیانی دڵەکان ، بۆیە ببە یەکێک لەوانەی یادی خوا دەکەن ، پێغەمبەری خوا (r) فەرموویەتی : (نموونەی ئەو کەسەی یادی خوا دەکات و ئەوەی یادی ناکات وەکو زیندوو و مردوو وایە )) .

وە ئەوەی گرنگە بگوترێت : زیکرێکی مەزن هەیە ، کە هۆکارێکە بۆ فەزڵێکی مەزن ، خوای بەرز و باڵا بە منەتی خۆی پێی بەخشیوین ، ئەویش ئەوەیە کە لە (صحيح البخاري)دا هاتووە لە فەرموودەی (شداد بن اوس) – ڕەزای خوای لەسەر بێت- لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی : (گەورەی دوعاکانی لێخۆشبوون بریتییە لەوەی بڵێیت : ئەی خودایە .. تۆ پەروەردگاری منی ، هیچ خودایەک نییە شایستەی پەرستن بێت بە هەق تەنها تۆ نەبێت ، تۆ منت دروست کردوە و منیش بەندەی تۆم ، منیش لە سەر پەیمان و بەڵێنەکەم ماوم تا لە توانامدایە ، پەنات پێ دەگرم لە خراپەی ئەوەی کردوومە و ئەنجامم داوە ، دان دەنێم بە نیعمەتەکانت بە سەرمەوە و دان دەنێم بە تاوانەکانمدا ، لە تاوانەکانم خۆشبە ، چونکە هیچ کەسێک لە تاوانەکان خۆش نابێت تەنها تۆ نەبێت ) دەڵێت : هەرکەسێک –ئەم دوعایە- لە ڕۆژدا بڵێت و لە دڵەوە یەقینی پێی هەبێت و لەو ڕۆژەدا بمرێت لە پێش ئەوەی ئێوارەی بە سەردا بێت ئەوا لە ئەهلی بەهەشتە و هەرکەسێک لە شەودا بڵێت و لە دڵەوە یەقینی پێی هەبێت و لەو شەوەدا بمرێت لە پێش ئەوەی ڕۆژی بە سەردا بێت ئەوا لە ئەهلی بەهەشتە) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٣٠٦).

### ئەو سوننەتانەی لە کاتێکدا کەسی خەوتوو خەو دەبینێ.



ئەوەی خەوتوو دەیبینێ لە یەکێک لەم سێ حاڵەتە بەدەر نییە لە فەرموودەکەی (أبو هريرة) دا هاتووە - ڕەزای خوای لەسەر بێت – کە لە (موسلیم) دا هاتووە .

١. خەوێکی چاک و باش ، ئەمەش موژدەیەکە لە لایەن خوداوە ، ئەمەش ئادابی خۆی هەیە لە پاشاندا باسی دەکەین .
٢. خەوێکی خەمۆکی ، ئەمەش لە شەیتانەوە ، وە هەرگیز زیان بە بەندە ناگەیەنێت ئەگەر ئادابەکانی جێ بەجێ کرد ، لە پاشاندا باسی دەکەین.
٣. ئەوە ببینێ کە لە پێش خەوتنەکەی لە نەفسی خۆیدا باسی کردبێت ، ئەوا هیچ نییە .

### جا لەو سوننەتانەی لەم بابەتەدا هاتوون ، چەند فەرموودەیەک لە بارەیەوە هاتووە :

لە (أبو سلمه) ەوە – ڕەزای خوای لێ بێت – فەرموویەتی : هەندێ جار خەونم دەبینی نەخۆشی دەخستم ، دەڵێ : بە (أبو قتادە)دا گەیشتم ، فەرمووی : هەروەها منیش هەندێ جار خەونم دەبینی نەخۆشی دەخستم ، تاوەکو گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : (خەونی خۆش و باش لە لایەن خوداوەیە ، جا ئەگەر یەکێک لە ئێوە خەونێکی خۆشی بینی ئەوا با لای کەس باسی نەکات تەنها لای ئەوانەی خۆشی دەوێت ، وە ئەگەر خەونێکی ناخۆشی بینی ئەوا کاتێ هەستا لە خەو با سێ

جار تف بکات بە لای چەپیدا و پەنا بگرێت بە خوا لە خراپەی شەیتان ، وە لای هیچ کەسێک باسی نەکات ئەوا چیتر زیانی پێ ناگەیەنێت).

(أبو سلمه) دەڵێت : (هەندێ جار خەونم دەبینی کە قورستر بوو لام لە چیایەک ، هەرکە ئەم فەرموودەیەم بیست چیتر هیچ گوێم پێ نەدەدا)

(بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٧٤٧) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٢٦١) ، وە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە : (خەونی باش لە لایەن خوداوەیە ، وە خەونی ناخۆش لە شەیتانەوەیە ، جا ئەگەر یەکێکتان خەونێکی ناخۆشی بینی لێی دەترسا ئەوا با سێ جار تف بکات بە لای چەپیدا و پەنا بگرێت بە خوا لە خراپەی ، ئەوا هیچ زیانی پێ ناگەیەنێت) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٢٩٢) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٢٦١) .

وە لە فەرموودەکەی (جابر)دا– رەزای خوی لەسەر بێت- کە لە (موسلیم) دا هاتووە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (سێ جار پەنا بگرێت بە خوا لە شەیتان و لە سەر ئەو لایە وەرگەڕێ کە لە سەری بووە) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٢٦٢) .

وە لە فەرموودەکەی (أبو سعید الخدری) – رەزای خوای لەسەر بێت- هاتووە لە (بوخاری)دا : (ئەگەر یەکێکتان خەونێکی بینی بە لایەوە خۆش بوو ئەوا لە خواوەیە ، بۆیە با سوپاسی خوای گەورەی لەسەر بکات) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٠٤٥).

**لە فەرموودەکانی پێشوودا بۆمان دەردەکەوێت :**

**١) کەسێک خەونێکی خۆشی بینی ، ئەوا سوننەتە ئەم کارانەی خوارەوە بکات :**

**یەکەم :** سوپاسی خوای لەسەر بکات ، چونکە ئەوە لە خواوەیە .

**دووەم :** باسی بکات و هەواڵ دەربارەی بدات ، وە تەنها هەواڵ بە خۆشەویستانی بدات .

**٢) وە ئەگەر کەسێک خەوێکی ناخۆشی بینی ، ئەوا سوننەتە ئەم کارانەی خوارەوە بکات :**

**یەکەم :** سێ جار بە لای چەپیدا تف بکات .

**دووەم :** پەنا بگرێت بە خوا لە شەیتان و لە خراپەی ئەوەی بینیویەتی سێ جار ، بەوەی بڵێت : (پەنا دەگرم بە خوا لە شەیتان و لە خراپەکەی) سێ جار .

**سێیەم :** هەواڵ بە هیچ کەسێک نەدات ، جا ئەگەر ئەوەی کرد ئەوا زیانی پێ ناگەیەنێت ، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێداوین ، وە دەتوانێت لەوە زیاتر بکات بەوەی :

**چوارەم :** لەسەر ئەو لایەی خەوتووە نەمێنێ ، ئەگەر لەسەر پشت خەوتبوو ئەوا با لەسەر لا بخەوێت و ئا بەم شێوەیە .

پێنجەم : هەستێت دوو رکات نوێژ بکات .

لە فەرموودەکانی پێشوو ئەم سوودانەی تێدایە : خەوی کەسی موسڵمان بەشێکە لە پێغەمبەرایەتی، وە لە هەموو کەس زیاتر خەوی راست بێت ئەو کەسەیە لە هەموو کەس زیاتر راستگۆ بێت لە کاتی بە ئاگابوونیدا ، ئەمەش لە کاریگەری راستگۆی وبەرەکەتییەتی لەسەر کەسی موسڵمان تەنانەت لە کاتی خەوتنیشیدا .

## هەرکەسێک بە شەو لە خەو هەستا ، ئەوا سوننەتە ئەم زیکرە بڵێت :



ئەویش ئەوەیە کە لە فەرموودەی (عبادة بن الصامت) ەوە - رەزای خوای لەسەر بێت - لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی : (هەر کەسێک شەو لە خەو هەستا و وتی : ( هیچ پەرستراوێک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت ، تەنها و بێ هاوەڵە ، موڵک و سوپاس و ستایش تەنها بۆ ئەوە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە، سوپاس و ستایش بۆ خوایە و پاکی بێگەردی بۆ خوا و هیچ خودایەک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت ، خوا لە هەموو شتێک گەورەترە ، هیچ هێز و توانایەک نییە تەنها بە خوای گەورەی باڵادەستی مەزن نەبێت ) ئەمجار پاڕایەوەو وتی: پەروەردگارا لە تاوانەکانم خۆشبە ، یان داوایەکی کرد ئەوا وەڵامی دەدرێتەوە ، جا ئەگەر هەستاو دەستنوێژی شوشت و نوێژی کرد ئەوا نوێژەکەی وەردەگیرێت ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١١٥٤) .

(إبن الأثير) – رەحمەتی خوای لێ بێت- فەرموویەتی : (مَن تَعارَ منَ الليلِ) واتە : راچڵەکی و لە خەو هەستا ( تەماشای : النهاية في غريب الأثر لابن الأثير (ص ١٠٨) بکە .

وە لەم فەرموودەدا دوو موژدەی مەزنی تێدایە : ئەویش ئەگەر کەسێک لە خەو هەستا و ئەم زیکرەی وت ، ئەویش : (لَا إِلَهَ إِلَا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وهُوَ عَلَى كُلِ شَيْءٍ قَدِيرٌ، الْحَمْدُ لِلَهِ، وَسُبْحَانَ اللَه ، وَلَا إِلَهَ إِلَا اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ ، وَلَا حَوْلَ ولَا قُوةَ إِلَا بِاللَه) هەرکەسێ ئەم زیکرە بڵێت دوو موژدەی بۆ هەیە :

یەکەم : ئەگەر وتی : (اللَّهُمَ اغْفِرْ لِي) یان دوعای کرد ئەوا دوعاکەی گیرا دەبێت .

دووەم : ئەگەر هەستا و دەستنوێژی شوشت ، ئەمجار نوێژی کرد ئەوا نوێژەکەی وەرگیراوە ، وە سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە بە فەزڵی خۆی منەتی بەسەردا رژاندووە ، وە داوای لێ دەکەین تەوفیقمان بدات بۆ کردار .

وە بەم سوننەتە لە پێشکەشکردنی (سوننەتە کات دیاریکراوەکان) دەبینەوە ، چونکە لە پاش ئەوانە چەند سوننەتێکن : هە ەستان لە خەو ، کە بە ئەوە دەستمان پێکرد و یەکەمی سیواکە و وتنی : (الْحَمْدُ لِلَهِ الَذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا اَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُشُورُ) ە.

# سوننەتەكات بۆ دیاری نەكراوەكان



**ئەمەش بەشی دووەمە لە سوننەتەكانی رۆژانە،** وە ئـەم جـۆرەش لـەو سوننەتانەیە كە بوارەكەی فراوانە، ئەمەش زۆرە ، وە هەیانە جیاوازن بە جیاوازی حاڵەتەكان و كەسەكان و شوێنەكان و كاتەكان .

هەوڵ دەدەم ئەو سوننەتانەی كە لە شەو و رۆژدا دووبارە دەبێتەوە بخەمە ڕوو ، داوای تەوفیق و پێكان لەخوا دەكەم.

وە یەكەم شت لە سوننەتەكانی ئەم بەشە :

سوننەتەكانی خواردن :

## سوننەتەکانی خواردن



### ١ وتنی (بسم الله) لە سەرەتای خواردندا .

لە (عمر بن أبو سلمة) - ڕەزای خوای لێ بێت - دەفەرموێت : (منداڵ بووم لە ماڵی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ، وە دەستەکانم بە پەلە ئەمسەرو ئەوسەری دەفرەکەی دەکرد ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وتم : (ئەی منداڵ .. ناوی خوا بهێنە و بە دەستی ڕاست بخۆ و لە پێش خۆتەوە بخۆ) چیتر ئەوە شێوازی خواردنم بووە ) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٣٧٦) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٠٢٢) .

وە ئەگەر وتنی (بسم الله)ی لەبیر چوو : ئەوا سوننەتە هەر کاتێ کەوتە بیری بڵێت : (بە ناوی خوا لە سەرەتاو کۆتاییەکەی).

بە بەڵگەی فەرموودەکەی دایکە عائیشە - ڕەزای خوای لەسەر بێت -کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر یەکێکتان دەستی بە خواردن کرد ئەوا با ناوی خوای گەورە لە سەرەتاوە بهێنێت، جا ئەگەر ناوی خوای لە سەرەتاوە لە بیر چوو ئەوا با بڵێت : بە ناوی خوای گەورە لە سەرەتا و کۆتاییەکەی) أبو داود ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٧٦٧) و الترمذي بە ژمارە (١٨٥٨) و الألباني بە صحیح ی داناوە هەروەکو لە پێشدا باسکرا .

هەروەها فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا مرۆڤ بە دەستی راستی دەخوات بۆ ئەوەی بەشەیتان نەچوێت ، جا کەسی موسڵمان ئەگەر ناوی خوا نەهێنێ ئەوا شەیتان بەشدار دەبێت لە گەڵیدا لە خواردنەکەیدا ، وە ئەگەر بە دەستی چەپ بخوات یان بخواتەوە ئەوا خۆی بە شەیتان شوبهاندووە ، چونکە شەیتان بە دەستی چەپی و دەخوات و دەخواتەوە .

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (عبدالله بن عمر) – رەزای خوای لەسەر بێت –کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (هیچ یەکێک لە ئێوە با بە دەستی چەپی نەخوات و پێی نەخواتەوە ، چونکە شەیتان بە دەستی چەپ دەخوات و دەخواتەوە ) دەڵێت : وە نافع ئەمەشی بۆ زیاد دەکرد : (وە پێی وەرنەگرێت و پێی نەبەخشێ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٠٢٠) .

وەشەیتان سوورە لەسەر ئەوەی بچێتە ماڵەکانەوە ، بۆ ئەوەی تێیدا بمێنێتەوە و بەشدار بێت لە گەڵ ئەهلەکەیدا لە خواردن و خواردنەوە ، لە (جابر بن عبدالله) وە –رەزای خوای لەسەر بێت- هاتووە کەوا گوێی لێ بووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر هەر کاتێک کەسێک چووە ژوورەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و ناوی خوای هێنا لە کاتی چوونە ژوورەوەی و لە کاتی خواردنیدا ، شەیتان دەڵێت : شوێنی خەوتن و خواردنی شێوانتان دەست نەکەوت ، بەڵام ئەگەر چووە ژوورەوەو ناوی خوای نەهێنا لە کاتی چوونە ژوورەوەیدا ، ئەوا شەیتان دەڵێت : شوێنی خەوتنتان دەستکەوت ، وە ئەگەر ناوی خوای نەهێنا لە کاتی خواردنەکەیدا ئەوا –شەیتان- دەڵێت : شوێنی خەوتن و خواردنی شێوانتان دەستکەوت) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٠١٨) .



## ٢ لە پێش خۆیەوە بخوات.

لە پێشدا باسی فەرموودەکەی (عمر بن أبي سلمة) – رەزای خوای لەسەر بێت- کرا ، وە ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) تێدایە : (وە لە پێش خۆتەوە بخۆ).

## ٣ هەڵگرتنی ئەو پارووەی دەکەوێت و لادانی ئەوەی پێوەی لکاوە و پاشان خواردنی .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (جابر) – رەزای خوای لەسەر بێت- فەرموویەتی : گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (شەیتان ئامادەی هەموو کاری یەکێکتان دەبێت ، تەنانەت ئامادەی کاتی خواردنی دەبێت ، جا ئەگەر پارووییەک لە دەستی یەکێکتان کەوتە خوارەوە ئەوا با هەر شتێکی پێوە لکاوە پاکی بکاتەوە و ئەمجار بیخوات ، وە با بۆ شەیتانی بە جێ نەهێڵێ ، وە ئەگەر تەواوی کرد ئەوا با پەنجەکانی بلێسێتەوە ، چونکە ئەو نازانێت لە کام خواردنێدا بەرەکەت هەیە) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٠٣٣).

ئەگەر هەرکەسێ وردبێتەوە لە فەرموودەکە دەبینێ شەیتان سوورە لەسەر بەشداری کردنی مرۆڤ لە هەموو کارەکانیدا ، بۆ ئەوەی بەرەکەت لە ژیانیدا داماڵێت ، وە زۆربەی کارەکانی مرۆڤ خراپ بکات و تێکی بدات ، وە ئەوەی بەڵگە بێت لەسەر سووربوونی شەیتان لەوەی هەردەم لە گەڵ بەندەدا دەبێت لە هەموو کارەکانیدا ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە دەفەرموێت : (شەیتان ئامادەی هەموو کاری یەکێکتان دەبێت)



## ٤ لێساندنەوەی پەنجەکان .

وە (لعقها) واتە : لێساندنەوەی بە زمانی ، جا سوننەتە کەوا بیلێسێتەوە یان جگە لە خۆی وەکو خێزانی بیلێسێتەوە (بە مەرجێ بێزی نەیەتەوە) ، بەڵکو سوننەتە دەستەکانی بە دەسڕ یان نمونەی ئەوە نەسڕێت تاوەکو دەیلێسێتەوە .

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (جابر)ە - رەزای خوای لێ بێت- کە لە پێشدا باسکرا .

لە هەردوو کتێبی (صحیح)دا هاتووە لە فەرموودەی (ابن عباس) ەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر یەکێکتان نانی خوارد ئەوا بە دەستی نەسڕێت تاوەکو دەیلێسێتەوە یان بۆی دەلێسنەوە -بۆ کەسێک بێزی نەیەتەوە-) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٤٥٦) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٠٣٣) .



## ٥ پاککردنەوەی دەفرەکە.

وە مەبەست لە (سلت القصعة) : ئەو کەسەی نانەکە دەخوات لێواری دەفرەکەی پاک بکاتەوە ، بۆ نمونە : کەسێک برنج دەخوات ، سوننەتە هیچ نەهێڵێ بە لێواری ئەو دەفرەی لێی دەخوات ، ئەوەی لێی ماوە دەیسڕێت و دەیخوات ، چونکە رەنگە بەرەکەت لەوەدا بێت کە ماوەتەوە بە لێواری دەفرەکەوە.

بەڵگەش لە سەر ئەوە : فەرموودەکەی (ئەنەس) ە -رەزای خوای لێ بێت - فەرموویەتی : (وە فەرمانی پێ کردین - واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ)- کە دەفرەکە پاک بکەینەوە لەوەی پێوە ماوە) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٠٣٤) وە لە ریوایەتێکی تردا لە (موسلیم) دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هريرە) وە - رەزای خوای لەسەر بێت - : (وە با هەر یەکێک لە ئێوە دەفرەکە پاک بکاتەوە لەوەی پێوە ماوە) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٠٣٥).

ماموٚستامان (ابن عثيمين) -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- فەرموویەتی : بە مانای ئەوەی : ئەو خواردنەی لکاوە بە پەنجەکانتەوە بیلیسیتەوە ، جا ئەمەش لەو سوننەتانەیە کە زۆرێک لە خەڵکی لێی بێ ئاگان بە داخەوە تەنانەت قوتابیان زانست و زانیاریش ) تەماشای : شرح رياض الصالحين بکە (٨٩٢/١) .

## ٦ خواردن بە سێ پەنجە .



سوننەتە بە سێ پەنجە بخوات ، ئەمەش بۆ ئەو شتانەیە کە بە سێ پەنجە هەڵدەگیرێت وەکو خورما ، بۆیە سوننەتە بە سێ پەنجە بیخوات .

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (كعب بن مالك ه - ڕەزای خوای لەسەر بێت - دەفەرموێت : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە سێ پەنجە دەیخوارد ، وە دەستی دەلێسایەوە پێش ئەوەی بیسڕێت) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٠٣٢) .

## ٧ هەناسەدان لە دەرەوەی دەفرەکە سێ جار .



سوننەتە لە دەفرەکە بە سێ جار بخواتەوە ، وە لە دوای هەر جارێک هەناسە بدات .

بەڵگەش لە سەر ئەوە : فەرموودەکەی (أنس)ه - ڕەزای خوای لەسەر بێت - دەفەرموێت : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتی خواردنەوەدا سێ جار هەناسەی دەدا، وە دەیفەرموو : زیاتر تینوێتی نامێنێ و چاکترە و زیانی کەمترە) (ئەنەس) دەڵێت : جا من سێ جار هەناسە دەدەم لە کاتی خواردنەوەدا) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٦٣١) و (موسلیم) بە ژمارە (٢٠٢٨) .

مەبەست لە هەناسەدان لە دەرەوەی دەفرەکە : هەناسەدان لە کاتی خواردنەوەیدا لە دەفرەکە: بە مانای ئەوەی : لە دەرەوەی دەفرەکە هەناسە بدات ، چونکە هەناسەدان لە دەفرەکەدا مەکروهە، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو قتادة) - ڕەزای خوای لەسەر بێت - کە لە هەردوو کتێبی (صحيح) دا هاتووە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر یەکێکتان خواردییەوە ئەوا با لە دەفرەکەدا هەناسە نەدات) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٦٣٠) و (موسلیم) بە ژمارە (٢٦٧) .




## ٨ حەمد و سەنای خوای گەورە لە پاش خواردن .

بەڵگەش لەسەر ئەم سوننەتە :

فەرموودەکەی (أنس بن مالک)ـە - ڕەزای خوای لەسەر بێت - دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە ڕازی دەبێت لەبەندە کاتێ خواردنێک دەخوات سوپاسی خوای لەسەر دەکات یان خواردنەوەیەک دەخوات سوپاسی خوای لە سەر دەکات) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٧٤٣) .

وە حەمد و سەنای خوا چەند شێوازێکی هەیە ، لەوانە :

أ- (سوپاس و ستایش بۆ خوا سوپاس و ستایشێکی زۆر و پیرۆز و پاک و پڕ بەرەکەت ، بە بێ نکۆڵی لێکردن و بە بێ وازلێهێنان و دەستلێهەڵگرتن لە پەروەردگارمان) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٤٥٨).

ب- (سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ناچاری دەستی هیچ کەسێکی نەکردین و تەنها خۆی بەسمانە ، تینوێتی شکاندووین بە بێ ڕەتکردنەوە و نکۆڵی لێکردن) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٤٥٩).

**(غَيْرَ مَكْفِيٍّ) : واتە : پێویستی بە هیچ کەس نەبێت ، هەر ئەو بەندەکانی نان دەدات و پێویستیان جێ بە جێ دەکات . (وَلا مُوَدَّعٍ ) واتە : وازی لێ نەهێناوە ، (كَفَانَا) لە کیفایەتەوە هاتووە، (أروانا) لە (الري) ئاودانەوە هاتووە ، (ولاً مكفور) واتە : نکۆڵی نەکردن لە فەزڵ و نیعمەتەکانی .**

## ٩ کۆبوونەوە لە سەر خواردن .



سوننەتە کۆبوونەوە لەسەر خواردن بکرێت و جیاوازی نەکرێت تێیدا .

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (جابر بن عبدالله)یە - ڕەزای خوای لەسەر بێت - دەڵێت : گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : (خواردنی کەسێک بەشی دوو کەس دەکات ، وە خواردنی دوو کەس بەشی چوار کەس دەکات ، وە خواردنی چوار کەس بەشی هەشت کەس دەکات) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٠٥٩) .

## ١٠ ستایش كردنی خواردن ئەگەر پێی باش بوو .

سوننەتە : ستایشی خواردنەكە بكات ئەگەر پێی باش بوو ، گومانیشی تێدا نییە ستایشی ناكات ئیللا بەوەی تێیدا بێت .

بەڵگەش لە سەر ئەوە : فەرموودەكەی (جابر بن عبدالله)یە – رەزای خوای لەسەر بێت – (پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای پێخۆرێكی كرد لە خێزانەكانی ، وتیان : هیچ شتێكیمان لە ماڵدا نییە تەنها خەڵ نەبێت ، ئەویش داوای كرد و دەیخوارد و دەیفەرموو : باشترین پێخۆر خەڵە ، باشترین پێخۆر خەڵە) (موسلیم) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٢٠٥٢) ، وە (خەڵ) جۆرێكە لە پێخۆر لای ئەوان ، ئەویش شیرینە و تورش نییە ، وەكو ئەو خەڵەی لای خۆمان .

مامۆستامان (ابن عثیمین) – رەحمەتی خوای لێ بێت- دەفەرموێت : هەروەها ئەمەش لە رێبازی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) كەوا ئەگەر خواردنێكی بە دڵ بوایە ئەوا ستایشی دەكرد ، هەروەها بۆ نمونە ئەگەر ستایشی نان بكەیت ، دەڵێیت : باشترین نان نانی بەنی فلانە ، یان لە نمونەی ئەوە ، هەروەها ئەمەش لە سوننەتی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) )) تەماشای (شرح ریاض الصالحین بكە ١٠٥٧/٢)

ئەوەی لە واقیعی ئەمڕۆمان وردبێتەوە دەبینێ زۆربەی خەڵكی كەوتونەتە ناو ناكۆكی لە گەڵ سوننەتدا ، جا ئەوان تەنها بە وازهێنان لە سوننەت رانەوەستاون ، بەڵكو جیاواز و ناكۆك بوون لە گەڵیدا ، بەوەی خواردنەكە عەیبدار دەكەن ، وە هەندێ جار زەمی دەكەن ، ئەمەش جیاوازە لە گەڵ رێبازەكەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ، لە هەردوو كتێبی (صحیح)دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هریرة) وە فەرموویەتی : (هەرگیز پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ چێشتێكی عەیبدار نەدەكرد ، ئەگەر حەزی لێ بوایە ئەوا دەیخوارد و ئەگەر نا ئەوا وازی لێ دەهێنا ) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٣٥٦٣) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٠٦٤) .

## ١١ دوعاكردن بۆ خاوەن خواردنەكە .

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەكەی (عبدالله بن بسر)ـە – رەزای خوای لەسەر بێت – فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووە میوانی باوكم ، ئێمەش خواردن و (وەتبە) مان پێشكەش كرد ، ئەویش لێی خوارد ، ئەمجار خورمایان بۆ هێنا ، ئەویش دەیخوارد و ناوكەكانی دەخستە نێوان پەنجەكانییەوە ، پەنجەی شایەتمان و ناوڕاستی لە یەک نابوو ، ئەمجار خواردنەوەیەكیان بۆ هێنا ئەویش خواردیەوە ، ئەمجار دای بەو كەسەی لای راستییەوە بوو ، دەڵێت: باوكم وتی – لە كاتێكدا رەشمەی وڵاخەكەی گرتبوو - : -ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)- دوعامان بۆ بكە ، ئەویش فەرمووی : (ئەی خودایە .. بەرەكەت بڕژێنە بە سەر ئەو رۆزییەی داوتنەتێ و لێیان خۆشبە و بەزەییت پێیاندا بێتەوە ) (موسلیم) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٢٠٤٢)

وە وەتبە (الوطبة) : ئەو خواردنەیە كە لە تێكەڵ كردنی خورمای بورنی و كەشكی كوتراو (هاڕاو) و رۆن دروست دەكرێت .

## ١٢ موستەحەببە ئەو کەسەی دەخواتەوە لە پاش خواردنەوەی خۆی بیداتە ئەو کەسەی لای راستێتی لە پێش ئەو کەسەی لای چەپێتی .

وە مەبەست لێی : ئەگەر شتێکی خواردەوە ئەوا سوننەتە بیداتە کەسی لای راستی پێش چەپی .

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (أنس بن مالک)ـە –رەزای خوای لێ بێت – دەفەرموێـت : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆ میوانیمان لە ماڵی خۆماندا ، داوای ئاوی کرد (داوای خواردنەوەیەکی کرد)، ئیمەش مەڕێکمان بۆ دۆشی ، ئەمجار لە گەڵ ئاوی ئەم بیرەماندا تێکەڵم کرد ، دەڵێت : منیش دام بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی خواردەوە و ئەبو بەکر لای راستییەوە و عومەر بەرانبەری و کەسێکی دەشتەکی لای راستیەوە بوو ، عومەر وتی : ئەوە ئەبو بەکرە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، دەیویست پیشانی بدات ، کەچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دای بە کابرای دەشتەکی ، وە وازی لە ئەبو بەکر و عومەر هێنا ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : لای راستەکان ، لای راستەکان ، لای راستەکان) (واتە : ئەوانەی لای راستن پێشیان بخەن) ئەنەس دەڵێت : جا ئەوە سوننەتە ، سوننەتە ، سوننەتە ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٥٧١) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٠٢٩) .

## ١٣ ئەوەی ئاو دابەش دەکات دوایین کەس دەخواتەوە .



سوننەتە ئەو کەسەی ئاو دەداتـە کۆمەڵێک خۆی دوایین کەس بخواتەوە.

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودە درێژەکەی (أبو قتادە)یە – رەزای خوای لەسەر بێت ، وە تێیدا هاتووە: فەرمووی : (جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاوی تێ دەکرد و منیش پێیانم دەدا ، تاوەکو هیچ کەسێک نەمایەوە تەنها من و پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبێت ، ئەمجار دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاوی تێکرد و پێی وتم : بخۆرەوە ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من ناخۆمەوە تاوەکو تۆ نەخۆیتەوە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەوەی ئاو دابەش دەکات دوایین کەس دەخواتەوە ، دەڵێت : منیش خواردمەوە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) خواردییەوە ... ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٨١) .

سوود بەدەست هاتوویەک : سوننەتە هەرکەسێ شیر بخواتەوە لە پاش خواردنەوە ئاو لە دەمی وەردات ، بۆ ئەوەی ئەو چەورییەی لە دەمیدا ماوەتەوە بە هۆی شیرەکەوە نەیهێڵێ ، بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (إبن عباس) – رەزای خوایان لەسەر بێت – (پێغەمبەری خوا (ﷺ) شیری خواردەوە ، ئەمجار داوای ئاوی کرد و ئاوی وەردایە دەمی و فەرمووی : ئەم شیرە چەوری تێدایە) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢١١) و(موسلیم) بە ژمارە (٣٥٨) .

## ١٤ داپۆشینی دەفرەکان و ناوی خوا هێنان لە کاتی هاتنی شەودا .

سوننەتە دەفرە سەر واڵاکان داپۆشرێن لە کاتی هاتنی شەودا و گرتن و داخستنی کوننەکان (إیکاء واتە : گرتنی ئەگەر جێی گرتنی هەبوو ) وە ناوی خوا هێنان لەو کاتەدا .

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (جابر بن عبدالله) – رەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : (دەفەرەکان داپۆشن و دەمی کونەکان بگرن ، لە ساڵێکدا شەوێک هەیە نەخۆشی تێدا دادەبەزێت ، بە سەر هیچ دەفرێکدا تێناپەڕێت سەرپۆشی نەبێت ، یان کونەیەک دەمی نەگیرا بێت ، ئیللا ئەو نەخۆشییەی دادەبەزێتە سەر ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٠١٤) هەروەها لە (بوخاری) دا هاتووە لە فەرموودەی (جابر)ەوە – رەزای خوایان لەسەر بێت- (دەمی کونەکانتان بگرن و ناوی خوا بهێنن و دەفرەکانتان داپۆشن و ناوی خوا بهێنن ، هەرچەندە ئەگەر تەنها شتێک بە سەریدا بدەن) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٦٢٣).





## دووەم : چەند سوننەتێکی سەلام کردن و بە یەک گەیشتن و دانیشتن



### ١ یەکێک لە سوننەتەکان : سەلامدانە .

حەقی موسڵمان لە سەر موسڵمان شەشن ، وتیان : ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟ فەرمووی: ئەگەر پێی گەیشتی سەلامی لێ بکە ، وە ئەگەر بانگی کردی ئەوا وەڵامی بانگەوازەکەی بدەرەوە ، وە ئەگەر داوای ئامۆژگاری لێ کردی ئەوا ئامۆژگاری بکە ، وە ئەگەر پژمی و وتی (الحمد لله) تۆیش وەڵامی بدەرەوە ، وە ئەگەر نەخۆش کەوت ئەوا سەردانی بکە وە ئەگەر وەفاتی کرد ئەوا شوێنی جەنازەکەی بکەوە ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢١٦٢) .

- بەڵام وەڵامدانەوەی واجیبە ، بەڵگەش لەسەری :ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ﴾ [النسا ء  واتە : و کاتێ بەهەرجۆرێک سڵاوتان لێبکرێ لەلایەن موسڵمانانەوە جا ئێوە بەجوانتر لەو چاک و چۆنی لەباوەڕداران بکەن، یان هەرهیچ نەبێت وەکو خۆی وەڵام بدەنەوە، بەڕاستیی خوا بەحسابی هەموو شتێک دەگاو لەگشت کەسێک دەپرسێتەوەو پاداشتی هەموو کارێکیش ئەداتەوە)

وە ئەصل و بنەماش لە فەرمانی داخوازیدا واجیب بوونە ئەگەر شتێک لە واجب بوونەکە لای نەدات بۆ شتێکی تر ، وە ئیجماع لەسەر واجیب بوونی لە یەکێک زیاتر لە زانایانەوە هاتووە کە ئەو ئیجماعەیان گواستوەتەوە ، لەوانە : ابن حزم و ابن عبدالبر و الشيخ تقي الدين و جگە لەوانە – رەحمەتی خوا لە هەموویان بێت – تەماشای : الآداب الشرعية بکە (٣٥٦/١) ط ، مؤسسة الرسالة.

وە باشترین و تەواوترین لەفز بۆ سەلامکردن و وەڵامدانەوەی ، ئەوەیە : (السلام عليكم ورحمة الله و بركاته) جا ئەمە باشترین سەلام و تەواوترینیانە .

ابن القيم –رەحمەتی خوای لێ بێت - دەفەرموێت : وە لە رێبازی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ئەوە بووە کە کۆتایی بە سەلامەکە بهێنێ تاوەکو (وبركاته) ) تەماشای : زاد المعاد بکە (٤١٧/٢) .

وە بڵاوکردنەوەی سەلام سوننەتە ، بەڵکو سوننەتێکە هاندانی زۆری تێدا هاتووە بە دەستکەوتنی فەزڵێکی زۆر ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو هريره) – رەزای خوای لەسەر بێـت – دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ، هەرگیز ناچنە بەهەشتەوە تاوەکو باوەڕ نەهێنن ، وە باوەڕ ناهێنن تاوەکو یەکترتان خۆش نەوێت ، ئایا رێگایەکتان پێ بڵێم ئەگەر جێ بە جێی بکەن ئەوا یەکترتان خۆش دەوێت ؟ سەلام کردن لە نێوانتاندا بڵاو بکەنەوە) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٤).

## ٢ موستەحەببە سەلامەکە سێ بارە بکرێتەوە ئەگەر پێویستی کرد .

وەکو ئەوەی گومانی هەبێت ئەو کەسەی سەلامی لێ کردووە گوێی لێ نەبووە لە جاری یەکەمدا، ئەوا موستەحەببە دووبارە بکرێتەوە ، وە ئەگەر نەیبیست ئەوا جاری سێیەم سەلام دەکات ، هەروەها ئەگەر چووە ژوورەوە بۆ لای کۆمەڵێکی زۆر ، وەکو ئەوەی بچێتە ژوورەوە بۆ لای مەجلیسێکی گەورە و خەڵکێکی زۆری تێدابوو ، جا ئەگەر یەک جار سەلام بکات ئەوا تەنها ئەوانەی سەرەتای مەجلیسەکە دەیبیسن ، بۆیە پێویست دەکات سێ جار سەلام بکات ، بۆ ئەوەی سەلامەکە هەموو ئەوانەی مەجلیسەکە بگرێتەوە .

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (أنس) – رەزای خوای لەسەر بێت- لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ): کەوا ئەگەر قسەیەکی بکردایە سێ بارەی دەکردەوە تاوەکو لێی تێ بگەن ، وە ئەگەر بهاتبایە بۆ لای کۆمەڵێک و سەلامی بکردایە ئەوا سێ جار سەلامی دەکرد ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٩٥) .

وە لە فەرموودەکەی (أنس)ی پێشووەوە چەند سوودێک وەردەگرین : وەکو سوننەت بوونی دووبارەکردنەوەی وشەیەک ئەگەر پێویستی کرد ، وەکو ئەوەی قسە بکات ولە قسەکەی تێنەگات ، بۆیە سوننەتە دووبارە بکرێتەوە ، وە ئەگەر تێنەگەیشت ئەوا سێ بارەی دەکاتەوە .



### ٣ سوننەتە سەلامکردنەکە هەموو کەسێک بگرێتەوە ئەوەی دەیناسیت و ئەوەی نایناسیت .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (عبدالله بن عمرو) –ڕەزای خوایان لێ بێت – (کابرایەک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد (ﷺ) کە چاکترین ئیسلام کامەیە ؟ ئەویش فەرمووی : خواردن ببەخشیت و سڵاو بکەیت لەو کەسانەی دەیاننناسی و ئەوانەی ناياننناسی) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (١٢) و(موسلیم) بە ژمارە (٣٩) .

### ٤ سوننەتە ئەو کەسە دەست بە سەلامکردنەکە بکات کەوا سوننەت هاتووە بە دەستپێکردنی .

لە (أبو هريره)وە هاتووە ، فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (سوار سڵاو لە پیادە دەکات و پیادە لە دایشتوو و کەم لە زۆر ) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٢٣٣) و(موسلیم) بە ژمارە (٢١٦٠) .وە لە ڕیوایەتەکەی (بوخاری) دا هاتووە : (کەسی بچووک سڵاو لە گەورە دەکات و ڕۆیشتوو لە دانیشتوو و کەم لە زۆر ) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٢٣٤) .

ئەمەش مانای ئەوە نییە ئەگەر جیاواز بوو لە سەلامکردنی ئەوەی لە پێشترە سەلام بکات مەکروهە ، بەڵکو ئاساییە ، بەڵام جیاوازە لە گەڵ کاری لە پێشتر ، وەکو ئەوەی گەورە سەلام لە منداڵ بکات یان ئەو کەسەی ڕێ دەکات سەلام بکات لە سوار و لە نمونەی ئەوانە .

### ٥ سوننەتە سەلام لە منداڵ بکرێت .



بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أنس بن مالک) – ڕەزای خوای لەسەر بێت – (کەوا لە گەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بە تەنیشت چەند منداڵێکدا تێپەڕین و سڵاوی لێکردن ) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٢٤٧) و (موسلیم) بە ژمارە (٢١٦٨) .

وە لە سەلام کردن لە منداڵان : وا لە نەفسی مرۆڤ دەکات خۆ بەزل نەزانێت ، وە منداڵان فێری ئەم شەعیرەتە بکرێت و لە ناخیاندا زیندوو بکرێتەوە.

## ٦ سوننەتە لە کاتی چوونە ماڵەوەدا سەلام بکات .



ئەمەش بەشێکە لە گشتگیری سەلام کردن ، ئەویش پاش ئەوەی سیواک دەکات ، چونکە سیواک سوننەتە لە کاتی چوونە ماڵەوە ، ئەمەش جێگای چوارەمە لەو جێگایانەی دووپاتکراوەتە لەسەر سوننەت بوونی سیواک ، ئەویش : لە کاتی چوونە ماڵەوەدا ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (دایکە عائیشە) کە لە (موسلیم) دا هاتووە دەفەرموێت : (ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بهاتایەتە ماڵەوە ئەوا بە سیواک دەستی پێ دەکرد) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٥٣) ، جا ئەگەر چووە ماڵەوە و سیواکی کردو سەلام دەکات لە خێزانەکەی ، تەنانەت هەندێ لە زانایان دەفەرموون : سوننەتە سەلام بکات ئەگەر چووە ماڵەوە ، هەر ماڵێک بێت ، تەنانەت ئەگەر کەسیشی تێدا نەبوو ، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت : ﴿ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ [النور:٦١]. واتە : هەرکاتیش چوونە ماڵانێکەوە سڵاو لەخۆتان و یەکتری بکەن، ئەمە درووديکی پیرۆز و پاکە لە لای خوا ئا بەو شێوەیە خوا ئایەت و ئادابەکانی خۆی ڕوون ئەکاتەوە بۆتان بەشکو تێ بگەن و ئەو ئایەتانە بکەنە بەرنامەی ژیانتان).

ابن حجر – رەحمەتی خوای لێ بێت - دەفەرموێت : وە لە باسی گشتگیری سەلامکردنەکە سەلام کردنە لە خۆ بۆ کەسێک چووە جێگایەکەوە کەسی تێدا نەبوو ، بە بەڵگەی ئەو ئایەتە :﴿ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ ...... ﴾ تەماشای : (فتح الباري) بکە فەرموودەی ژمارە (٦٢٣٥) باب إفشاء السلام .

سوود بەدەست هاتوویەک :

بە پێی ئەوەی پێشوو سوننەتە لە کاتی چوونە ژوورەوەدا بۆ ماڵ سێ سوننەت ئەنجام بدرێت .

**یەکەم :** ناوی خوا بهێنێ بە تایبەتی شەوان .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (جابر بن عبدالله) -ڕەزای خوایان لەسەر بێت – کەوا گوێی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو : (ئەگەر هەر کاتێک کەسێک چووە ژوورەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و یادی خوای گەورەی کرد لە کاتی چوونە ژوورەوەی و لە کاتی خواردنیدا ، شەیتان دەڵێت : شوێنی خەوتن و خواردنی شێوانتان دەست نەکەوت ، بەڵام ئەگەر چووە ژوورەوە یادی خوای نەکرد لە کاتی چوونە ژوورەوەیدا ئەوا شەیتان دەڵێت : شوێنی خەوتنتان دەستکەوت ، وە ئەگەر یادی خوای نەکرد لە کاتی خواردنەکەیدا ئەوا –شەیتان- دەڵێت : شوێنی خەوتن و خواردنی شێوانتان دەستکەوت) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٠١٨) .



**دووەم :** سیواک . بە بەڵگەی فەرموودەکەی (دایکە عائیشە) لە پێشدا باسکرا و تەخریج کرا .

**سێیەم :** سەلام کردن لەوانەی لە ماڵەکەدان .

## ٧ سوننەتە دەنگی نزم بکاتەوە بە سەلامکردنەکە ئەگەر چووە ژوورەوە بۆ لای کۆمەڵێک خەوتوویان تێدا بوو .

ئا بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنجامی دەدا ، هەروەکو لە فەرموودەکەی (المقداد بن الأسود) دا هاتووە – رەزای خوای لەسەر بێت – تێیدا هاتووە ، فەرمووی : (... ئێمە شیرمان دەدۆشی و هەر یەک لە ئێمە بەشەکەی خۆی دەخوارد و بەشەکەی پێغەمبەری خوامان (ﷺ) دەبردە خزمەتی، دەڵێت : شەو بە سەردا دەهات ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەلامی دەکرد بە شێوەیەک کەوا کەسی خەوتووی هەڵنەدەساند و کەسی بە ئاگا گوێی لێ بوو ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٠٥٥) .

## ٨ سوننەتە سەلام بگەیەنێت .

جا گەیاندنی سەلام سوننەتە وەکو ئەوەی کەسێک پێت بڵێت : سەلام بکە لە فلان کەس) ئەوا سوننەتە ئەو سەلامە بگەیەنیتە خاوەنەکەی.

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (دایکە عائیشە) یە – رەزای خوای لەسەر بێت- کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرمووە : (جبریل سەلامت لێ دەکات) دەڵێت : منیش وتم : وَعَلَيْهِ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللهِ ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٢١٧) و (موسلیم) بە ژمارە (٢٤٤٧) .

لە فەرموودەکەدا بەڵگەی ئەوە هاتووە کەوا سەلام بگەیەندرێتە خاوەنەکەی ، هەروەکو چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەلامەکەی جبریلی گەیاندە (دایکە عائیشە) ، هەروەها لە فەرموودەکەی پێشوودا بەڵگەی ئەوەی تێدایە کەوا سوننەتە بە کەسێکدا سەلام رەوانە بکرێـت .

## ٩ سەلام کردن لە کاتی چوونە ژوورەوە بۆ هەر مەجلیسێک و لە کاتی جیابوونە لێی .



بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو هريره) – رەزای خوای لەسەر بێت- فەرمووی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر یەکێکتان چوونە مەجلیسێکەوە با سەلام بکات و ئەگەر ویستی هەڵسێت ئەوا با سەلام بکات ، چونکە یەکەمەکەی لە پێشتر نییە لە کۆتاییەکەی) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٩٦٦٤) و أبو داود بە ژمارە (٥٢٠٨) والترمذي بە ژمارە (٢٧٠٦) و الألباني بە (صحيح)ی داناوە (صحيح الجامع ١/١٣٢) .

## ١٠ سوننەتە لە کاتی بە یەک گەیشتندا لە گەڵ سەلامدا تەوقە بکرێت.



وە لەسەر ئەمە هاوەڵان کاریان کردووە – ڕەزای خوا لە هەموویان بێت - بەڵگەش لەسەر ئەوە فەرموودەکەی (أبو قتادة)یە – ڕەزای خوای لەسەر بێت – دەڵێت : (بە ئەنەسم گوت : تەوقەکردن لە ناو هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) هەبوو ؟ وتی : بەڵێ) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٢٦٣) .

## ١١ سوننەتە لە کاتی بە یەکگەیشتندا زەردەخەنە بکات و ڕووی گەش بکاتەوە .



بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو ذر) – ڕەزای خوای لەسەر بێت – دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وتم: (هەرگیز چاکە بە کەم مەزانن ، هەرچەندە ئەگەر بە ڕوویەکی گەشەوە بگەیتە برایەکی خۆت) (موسلیم) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٦٢٦) وە لە (الترمذي) دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو ذر) – ڕەزای خوای لەسەر بێت – پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (زەردەخەنەت بە ڕووی براکەتدا خەیر و صەدەقەیە بۆت) (الترمذي) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (١٩٥٦) وە الألباني بە صحیح ی داناوە (الصحيحة ٥٧٢)

## ١٢ وتنی وشەیەکی چاک سوننەتە چونکە صەدەقەیە .

جا ئەگەر هاتوو لە کاتی بە یەک گەیشتندا بوو یان لە دانیشتندا یان لە هەر حاڵێکدا بوو ، جا وتنی وشەیەکی چاک سوننەتە چونکە صەدەقەیە.

بەڵگەش لەسەر ئەوە فەرموودەکەی (أبو هريرة)یە – ڕەزای خوای لەسەر بێت – دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (وشەی باش و چاک صەدەقەیە) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٩٨٩) و (موسلیم) بە ژمارە (١٠٠٩) .

زۆر جار وشەی چاک دێت بە سەر زمانی خەڵکیدا ، ئەگەر چاوەڕوانی پاداشت بکەن لە خواوە ئەوا خەیرێکی زۆریان دەگات ، وە بە هۆیەوە صەدەقەیەکی زۆر و فراوانیان دەست دەکەوێت .

مامۆستامان ابن عثيمين – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – فەرموویەتی : وشەی چاک وەکو ئەوەی پێی بڵێیت: تۆ چۆنی ؟ ئەحواڵت چۆنە ؟ براکانت چۆنن ؟

کەسوکارت چۆنن ؟ وە لە نمونەی ئەوانە ، چونکە ئەمە لەو وشانەیە بە هۆیەوە خۆشگوزارنی دەخەیتە دڵی براکەتەوە ، هەموو وشەیەکی چاک ئەوا صەدەقەیەک و پاداشت و ئەجرت بۆ دەنوسرێت لای خوای گەورە) تەماشای (شرح ریاض الصالحین) بکە لە نوسینی مامۆستامان (٩٩٦/٢) (باب : استحباب طیب الکلام ، وطلاقة الوجه عند اللقاء .)

## ١٣ موستەحەببە زیکری خوای گەورە بکرێت لە مەجلیسدا.



ئەو فەرموودانەی دەربارەی فەزڵی مەجلیسی زیکر و هاندان بۆی زۆرن . لەوانە فەرموودەکەی (أبو هریره) – ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە فریشتە گەلێکی هەیە بە رێگاکاندا دەگەڕێن بە دوای ئەهلی زیکردا، ئەگەر کۆمەڵێکیان بینی زیکری خوا دەکەن بانگی یەکتر دەکەن : وەرن بۆ پێویستییەکەتان ، دەڵێت: دەوریـان دەدەن بە باڵەکانیان تاوەکو ئاسمانی دونیا...) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمـارە(٦٤٠٨)و (موسلیم) بە ژمارە(٢٦٨٩) .

## ١٤ سوننەتە بە (کفارة المجلس) کۆتایی بە مەجلیسەکە بهێنێت.

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو هریرة) – ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (هەرکەسێک لە مەجلیسێکدا دانیشت و قسەی بێ مانا و پڕوپووچی زۆر کرد ، جا لە پێش ئەوەی هەستێت لە مەجلیسەکە وتی : ( ئەی خوایە ..پاکی و بێگەردی و سوپاس بۆ تۆیە ، شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها تۆ نەبێت ، داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ) ئەوا خوای گەورە لە تاوانەکانی مەجلیسەکەی خۆش دەبێت) (الترمذي) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٤٣٣) وە الألباني بە (صحیح)ی داناوە (صحیح الجامع ٢/ ١٠٦٥).

## سێیەم : سوننەتەکانی پۆشاک و رازاندنەوە





### ١ سوننەتە بە لای راست دەست پێ بکات لە لەبەرکردنی پێڵاوو نەعلدا

سوننەتە ئەگەر کەسی موسڵمان ویستی نەعلەکەی لە پێ بکات بە پێی راست دەست پێ بکات ، وە سوننەتە ئەگەر ویستی نەعلەکانی داکەنێت بە پێی چەپ دەست پێ بکات .

بەڵگەش لەسەر ئەوە : فەرموودەکەی (أبو هريره) یە – رەزای خوای لەسەر بێت – کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر یەکێکتان نەعلێکی لە پێکرد ئەوا با بە پێی راستی دەست پێ بکات و ئەگەر دایکەند با بە پێی چەپی دەست پێ بکات ، با پێی راستی یەکەم پا بێت لە پێ دەکرێت و دوایینی بێت لە داکندندا) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٥٨٥٦) .

وە لە لەفزێکی تردا کە (موسلیم) ریوایەتی کردووە : (با هیچ یەکێک لە ئێوە بە یەک نەعلەوە رێ نەکات ، با هەردوو لە پێ بکات ، یان هەردوو داکەنێت) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٠٩٧) .

### جا لەم دوو فەرموودەدا ، سێ سوننەتی تێدایە :

١. بە پێی ڕاست دەست پێ بکات لە کاتی لە پێ کردندا .

٢. بە پێی چەپ دەست پێ بکات لەکاتی داکەندنیدا.

٣. یان هەردوو نەعلەکەی لە پێ بکات و یان هەردووی داکەنێت بە شێوەیەک بە یەک نەعلەوە ڕێ نەکات .

## ٢ لەبەرکردنی پۆشاکی سپی سوننەتە .



مەبەستی ئەوەیە کەوا لە نێو ڕەنگەکاندا سپی لەبەر بکات چونکە ئەوە سوننەتە ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (ابن عباس - ڕەزای خوای لەسەر بێت - دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (لە نێو پۆشاکەکانتاندا سپی لە بەر بکەن چونکە ئەوە باشترین پۆشاکتانە ، وە مردووەکانتانی پێ کفن بکەن) (ئەحمەد) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٢١٩) و أبوداود بە ژمارە (٣٨٧٨) و الترمذي بە ژمارە (٩٩٤) و الألبانی بە صحیح ی داناوە (صحیح الجامع ١ /٢٦٧)

مامۆستامان ابن عثيمين - ڕەحمەتی خوای لێ بێت - فەرموویەتی : ئەمەش گشتگیرە بۆ لەبەرکردنی پۆشاکی سپی : کراس و ئیزار و شەرواڵ ، هەموویان پێویستە سپی بن چونکە باشترە ، بەڵام ئەگەر ڕەنگێکی تری لەبەر کرد ئەوا ئاساییە ، بە مەرجێ لەوانە نەبێت کە تایبەتن بە ئافرەت ) تەماشای: (شرح رياض الصالحين) بکە لە نوسینی مامۆستامان (١٠٨٧/٢).

### ٣ سوننەتە بۆنی خۆش بەكار بهێنێ .



بە بەڵگەی فەرموودەكەی (أنس) رەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (لە دونیادا چەند شتێكم لا خۆشەویستە : ئافرەتان و بۆنی خۆش و بیلبیلەی چاوی من لە نوێژدایە) ئەحمەد ریوایەتی كردووە بە ژمارە (١٢٢٩٣) و نەسائی بە ژمارە (٣٩٤٠) و الألبانی لە (صحیح النسائی)دا فەرموویەتی : (حسن صحیح) .

بەڵام لەفزی : (حُبِبَ إلیَ مِنْ دُنْیَاكُمْ ثَلَاثٌ) ئەوا فەرموودەیەكی (ضعیف)ـە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ناخۆش بوو كەوا بۆنی ناخۆشی لێوە بێت : لە (بوخاری)دا هاتووە لە فەرموودەیەكی درێژی دایكە عائیشەوە – رەزای خوای لەسەر بێت- فەرموویەتی : (وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر گران بوو لەسەری كەوا بۆنێكی هەبوایە) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٦٩٧٢) واتە : بۆنێكی ناخۆش.

**مەكروهە بۆنی خۆش بگێڕێتەوە .**

بە بەڵگەی فەرموودەكەی (أنس) – رەزای خوای لێ بێت –

(پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆنی خۆشی نەدەگێڕایەوە) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٢٥٨٢).

### ٤ سوننەتە بە لای راست دەست پێ بكات لە كاتی سەر شانەكردندا.



**مەبەست لە (ترجیل الشعر) : شانەكردنیەتی ، جا سوننەتە بە لای راست دەست پێ بكات ئەمجار لای چەپ.**

**بەڵگەش لەسەر ئەوە :**

**فەرموودەكەی دایكە عائیشەیە – رەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی خۆش بوو لای ڕاست بەكاربهێنێ لە نەعل لە پێكردنیدا و لە قژ شانە كردنیدا و لە دەستنوێژیدا و لە هەموو كار وبارەكانیدا) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (١٦٨) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٦٨) .**



## چوارەم : سوننەتەكانی پژمین و باوێشك





### سوننەتەكانی پژمین :

**١ سوننەتە ئەو كەسەی دەپژمێت بڵێت : (الحمد لله) .**

بە بەڵگەی فەرموودەكەی (أبو هريره) – رەزای خوای لێ بێت- لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر یەكێكتان پژمی ئەوا با بڵێت : (الحمد لله) سوپاس و ستایش بۆ خوا ، ئەمجار ئەوانەی وان لە دەورو بەری با بڵێن : (یرحمك الله) خوا رەحمەت لێبكات ، جا ئەویش با وڵامیان بداتەوە و بڵێت : (یهدیكم الله ویصلح بالكم) خوا رێنموییتان بكات و كارو كردەوەتان چاك بكات (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٦٢٢٤) .

سوننەتە جۆراوجۆری بكات و هەندێ جار بڵێت : (سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە لە هەموو حاڵەتێكدا) لە ریوایەتێكی (أبوداود) دا هاتووە : (ئەگەر یەكێكتان پژمێ ئەوا با بڵێت : سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە لە هەموو حاڵەتێكدا) (أبوداود) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٥٠٣١) و ابن القيم – رەحمەتی خوای لێ بێت- دەربارەی ئەم فەرموودەیە لە (زاد المعاد ٤٣٦/٢) دا فەرموویەتی : ئیسنادەكەی (صحيح) ە ).

ئەو كەسەی وەڵامی دەداتەوە دەڵێت : (یرحمك الله) وە سوننەتە ئەو كەسەی پژمیوە وەڵامی بداتەوە و بڵێت : (خوا رێنموییتان بكات و كارو كردەوەتان چاك بكات ) هەموو ئەمانە فەرموودەكەی (أبو هريرة)ی پێشوو بەڵگەیە لەسەری .

### ٢ ئەگەر ئەو كەسەی پژمی و نەیوت : (الحمد لله) ئەوا سوننەتە وەڵام نەدرێتەوە.

ئەگەر ئەو كەسەی پژمی و نەیوت : الحمد لله ، ئەوا سوننەت نییە وەڵام بدرێتەوە ، بەڵكو سوننەتە وەڵام نەدرێتەوە ، بە بەڵگەی فەرموودەكەی (أنس) – ڕەزای خوای لەسەر بێت – فەرموویەتی : (دوو پیاو لای پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پژمین ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەڵامی یەكێكیانی دایەوەو وەڵامی ئەویتریانی نەدایەوە ، كابرا وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەڵامی ئەوت دایەوە و وەڵامی منت نەدایەوە ، فەرمووی : ئەم پیاوە حەمدی خوای كرد (واتە : وتی الحمد لله) و تۆ حەمدی خوات نەكرد(واتە : تۆ نەتوت الحمد لله) (بوخاری) ڕیوایەتی كردووە بە ژمارە (٦٢٢٥) ئەمە لە كرداری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووە ، وە لە قسەكانیشیدا هاتووە لە فەرموودەیەكدا (موسلیم) ڕیوایەتی كردووە لە فەرموودەی (أبوموسى)وە – ڕەزای خوای لێ بێت – دەڵێت : گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : (ئەگەر یەكێكتان حەمدی خوای كرد ئەوا وەڵامی بدەنەوە و ئەگەر حەمدی خوای نەكرد ئەوا وەڵامی مەدەنەوە) (موسلیم) ڕیوایەتی كردووە بە ژمارە (٢٩٩٢) .

بەڵام ئەگەر جێگا و مەقامەكە جێگا و مەقامی فێركردن بوو وەكو ئەوەی باوكێك منداڵەكەی فێر دەكات ، یان مامۆستایەك قوتابیەكانی ، یان لە نمونەی ئەوانە كە جێگای فێركردن بێت ، ئەوا پێی دەڵێت : بڵێ : الحمد لله ، بۆ ئەوەی لەسەر ئەم سوننەتە پەروەردەی بكات چونكە ڕەنگە نەزانێت سوننەتە .

هەروەها ئەگەر كەسەكە هەڵامەتی بوو ئەوا لە پاش سێ جار وەڵام نادرێتەوە ، ئەگەر سێ جار پژمی ئەوا وەڵام دەدرێتەوە و لە پاش ئەوە وەڵام نادرێتەوە .

بەڵگەش لەسەر ئەوە : ئەو فەرموودەیە كە (أبو داود) لە (سنن)ەكەیدا لە (أبو هريره) وە ڕیوایەتی كردووە بە (موقوف )ی و بە (مرفوع)ی ، دەڵێت : (وەڵامی براكەت بدەرەوە سێ جار وە ئەگەر لەوە زیاتر بوو ئەوا هەڵامەتە) (أبو داود) ڕیوایەتی كردووە بە ژمارە (٥٠٣٤) وە الألبانی –ڕەحمەتی خوای لێ بێت- فەرموویەتی : (حسن موقوف و مرفوع) (صحيح أبى داود ٣٠٨/٤) .

وە ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەكی تر پشتگیری دەكات كە (موسلیم) ڕیوایەتی كردووە لە (صحيح) ەكەیدا ، لە فەرموودەی (سلمه بن الأكوع) كەوا گوێی لێبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە كاتێكدا كابرایەك لایدا پژمی ، پێی فەرموو : (يرحمك الله ) كابرا جارێكی تر پژمی ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو : ئەم كابرایە هەڵامەتی هەیە) (موسلیم) ڕیوایەتی كردووە بە ژمارە (٢٩٩٣) .

**بە پێی ئەوانەی پێشوو كەسێك پژمی لە دوو حاڵەتدا وەڵام نادرێتەوە :**

١ ئەگەر نەیگوت (الحمدلله)

٢ ئەگەر لە سێ جار زیاتر بوو ،چونكە ئەوە هەڵامەتە.

##  سوننەتەکانی باوێشکدان.

### سوننەتە باوێشکەکەی قوتداتەوە ، یان بە دەستی بیگێڕێتەوە .

بەڵگەش لەسەر ئەوە :



فەرموودەکەی (أبو هريرة) – ڕەزای خوای لەسەر بێت – لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی : (خوای گەورە پژمینی پێخۆشە و رقی لە باوێشکە ، جا ئەگەر یەکێکتان پژمی و سوپاس و ستایشی خوای کرد ئەوا حەقی لە سەر هەموو موسڵمانێک هەیە گوێبیستی بێت پێی بڵێت: خوا رەحمت لێبکات ، بەڵام باوێشک لە شەیتانەوەیە ، جا ئەگەر یەکێکتان باوێشکی بۆ هات ئەوا تا دەتوانێ با بیگێڕێتەوە ، چونکە ئەگەر یەکێکتان باوێشکی دا و وتی : ها ... ئەوا شەیتان پێی پێدەکەنێ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٦٦٣) .

وە لە (موسلیم) دا هاتووە لە فەرموودەی (أبوسعید)ەوە –ڕەزای خوای لەسەر بێت – پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەگەر یەکێکتان باوێشکی بۆ هات ئەوا با دەست لەسەر دەمی دانات چونکە شەیتان دەچێتە ژوورەوە) . (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٩٩٥) ، جا قوتدانەوەی باوێشک ، یان زاڵ دەبێت بە سەریدا لە ڕێگای دەمەوە ، ئەویش بە ڕێگری کردن لە کردنەوەی یان فشار خستنە سەری بە ددانەکانی ، وە یان بە دەست خستنە سەر دەم و نمونەی ئەوانە .

هەروەها باشترە ئەو کەسەی باوێشک دەدات دەنگی بەرز نەکاتەوە بە باوێشکەکەی ، وەکو ئەوەی بڵێت : (ها ) یان (ئاە) وە نمونەی ئەو دەنگانەی لێوەی دەردەچێت ، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی شەیتان پێی پێبکەنێت .

بەڵگەش لەسەر ئەوە :

فەرموودەکەی (أبو هريرة) – ڕەزای خوای لەسەر بێت- لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی: (باوێشک لە شەیتانەوەیە ، جا ئەگەر یەکێکتان باوێشکی بۆ هات ئەوا تا دەتوانێ با بیگێڕێتەوە ، چونکە ئەگەر یەکێکتان باوێشکی دا و وتی : ها ..ئەوا شەیتان پێدەکەنێ)

(بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٢٩٨) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٩٩٤) .

ئاگادارییەک : خەڵکی ڕاهاتوون لە پاش باوێشکدان دەڵێن : (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم) ، وە هیچ بەڵگەیەک لەسەری نییە بەڵکو جیاوازە لە گەڵ ڕێبازی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ، چونکە زیکرێکی وتوە لەم جێگایەدا کە پیغەمبەری خوا (ﷺ) نەیگوتوە .

## پێنجەم : چەند سوننەتێکی تری رۆژانە



### وتنی ئەو زیکرەی لە کاتی چوونە ژوورەوە بۆ ئاودەست و هاتنە دەرەوە هاتووە .



بۆیە سوننەتە ئەو کەسەی دەچێتە ئاودەستەوە ئەو زیکرە بڵێت کە لە هەردوو کتێبی (صحیح)دا هاتووە :

لە (أنس)ەوە هاتووە : (ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بچوایەتە ئاودەستەوە : دەیفەرموو : (اللهُمَ إني أعوذُ بِكَ مِنَ الخُبْثِ والخبائِثِ) واتە : ئەی خودایە .. پەنات پێ دەگرم لە شەیتانە نێر و مێیەکان ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٣٢٢) و(موسلیم) بە ژمارە (٣٧٥) .

(الخبُث) نێرەی شەیتانەکان ، وە (الخبائث) مێیەکانیانە ، بۆیە پەنا دەگرێت بە خوا لە نێرەی شەیتانەکان و مێیەکانیان .

وە (الخبْث) واتە : خراپەکاری ، وە (الخبائث) نەفسە پیس و خراپەکان ، بۆیە پەنا دەگرێت بە خوا لە خراپەکاری و ئەهلەکەی ، وە بە (سکون) گشتگیرترە.

## وە سوننەتە هەرکەسێ لە ئاودەست دەرچوو بڵێت :

ئەوەی لە (مسند أحمد و سنن أبي داود و الترمذي)دا هاتووە و الألباني بە صحيح ی داناوە لە دایکە عائیشەوە – ڕەزای خوای لەسەر بێت - دەڵێت : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر لە ئاودەست دەرچوایە دەیفەرموو: (غفرانک) واتە : ئەی خودایە داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم) ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٥٢٢٠) و أبو داود بە ژمارە (٣٠) و الترمذي بە ژمارە (٧) و الألباني بە صحيح ی داناوە (تحقيق مشكاة المصابيح ١١٦/١)

## نوسینی وەصێتنامە سوننەتە.



جا وەصێتنامە سوننەتە بۆ هەموو موسڵمانێک لە کاتی نەخۆشیدا یان لەشساغیدا ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) : (مافی هیچ موسڵمانێک نییە کە شتێکی هەبێت و بیەوێت وەسێتی پێ بکات ، شەوێک یاخود دوو شەو بمێنێتەوە مەگەر وەسێتەکەی نوسرابێت لەلای) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٧٨٣) و (موسلیم) بە ژمارە (١٦٢٦) لە فەرموودەی (ابن عمر) ەوە – ڕەزای خوایان لێ بێت – وە باسکردنی دوو شەو لە فەرموودەکەدا بۆ دیاری کردن نییە ، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە ماوەیەکی کەمی بەسەردا تێنەپەڕێت ئیللا وەصێتنامەکەی لە ژوور سەری نوسرابێت، چونکە ئەو نازانێت کەی دەمرێت ، ئەمەش سوننەتێکی گشتییە بۆ هەموو خەڵکی .

بەڵام ئەو وەصێتانەی کە مافەکانی خوای تێدایە وەکو زەکات و حەج و کەففارەت ، یان مافەکانی خەڵکی تێدایە وەکو قەرز و گەڕاندنەوەی ئەمانەت ، ئەوا وەصێتنامە لەمەدا واجیبە نەک سوننەت ، چونکە مافی واجیبی پێوە پەیوەستە ، بە تایبەتی ئەگەر ئەو مافانە هیچ کەسێک نەیدەزانی ( وە هیچ شتێک واجیبی پێ تەواو نەبێت بە ئەوەوە نەبێت ئیللا ئەویش واجیبە) .

## لێبوردەیی و نەرم و نیانی لە کڕین و فرۆشتندا .



ئەویش بەوە دەبێت کەسی کڕیار و فرۆشیار خۆیان برازێننەوە بە لێبوردەیی و نەرم و نیانی لە کاتی فرۆشتندا، وە هیچ یەکێکیان بەرانبەر بەوی تر توند نەبێت لە نرخ و دەمەقاڵە تێیدا بەڵکو هەردوو لێبوردە بن .

بەڵگەش لەسەر ئەوە :

فەرموودەکەی (جابر بن عبدالله) – ڕەزای خوای لێ

بێت - کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ڕەحمەتی خوا لەو پیاوەی لێبوردەیە ، ئەگەر شتێکی فرۆشت یان ئەگەر شتێکی کڕی یان ئەگەر داوای مافی خۆی کرد) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٠٧٦) .

هەروەها ئەگەر داوای حەقەکەی خۆی کرد ئەوا سوننەتە بە سووک و ئاسانی و نەرم و نیانی داوای بکات ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) : (وَإِذَا اقْتَضَى) واتە : ئەگەر داوای مافی خۆی کرد).

## ئەنجامدانی دوو ركات نوێژ لە پاش هەموو دەستنوێژێک



ئەمەش لە سوننەتەکانی ڕۆژانەیە کە فەزڵێکی زۆری لەسەر بنیات دەنرێت . ئەویش : چوونە بەهەشتە ، لە (أبو هريرة) وە هاتووە - ڕەزای خوای لێ بێت -کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە بیلالی فەرموو لە کاتی نوێژی بەیانیدا : (ئەی بیلال باسی چاکترین کارێک کە لە ئیسلامدا کردبێتت بۆم بکە ، چونکە من گوێم لە دەنگی پێڵاوەکانت بوو لە بەر دەستمدا لە ناو بەهەشتدا) فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ کردارێک نییە لای من چاکتر بێت لەوەی کە هەر کاتێک دەستنوێژ بشۆرم لە هەر ساتێکی شەو یان ڕۆژدا ئەوا بەو دەستنوێژە چەند ركاتێک نوێژ دەکەم) .(مەبەستی نوێژی دەست نوێژە ) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (١١٤٩) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٤٥٨) ، وە (دَفَّ نَعْلَيْكَ) واتە : جوڵانی نەعلەکانت .

## چاوەڕوانکردنی نوێژەکان .



چاوەڕوانکردنی نوێژەکان لەو سوننەتانەیە کە فەزڵێکی زۆری لەسەر بنیات دەنرێت .

**بەڵگەش لەسەر ئەوە :**

فەرموودەکەی (أبو هريرة) - ڕەزای خوای لەسەر بێت - کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (هەر یەکێکتان بـەردەوام لە نوێژدایە مادام نوێژەکەی هۆی مانەوەیەتی، هیچ ڕێگرێک نییە بچێتەوە بۆ لای خێزانەکەی ئیللا نوێژەکەی نەبێت ) (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٥٩) و(موسلیم) بە ژمارە (٦٤٩) ، جا ئەو بەو چاوەڕوانییە پاداشتێکی زۆری دەست دەکەوێت .

لە (أبو هريرة) وە ریوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ( فریشتەکان سڵاوات دەدەنە دیار کەسێکتان تا لە جێ نوێژگەکەیدا مێنێتەوە کە نوێژی تێدا کردووە ، تاکو دەستنوێژەکەی مێنێت ، فریشتەکان دەڵێن : ئەی خودایە لە تاوانەکانی خۆش بە ، ئەی خودایە رەحمی پێ بکە ، وە هەر یەکێکتان بەردەوام لە نوێژدایە مادام نوێژەکەی هۆی مانەوەیەتی ، هیچ رێگرێک نییە بچێتەوە بۆ لای خێزانەکەی ئیللا نوێژەکەی نەبێت)) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٥٩) و(موسلیم) بە ژمارە (٦٤٩) ، وە مەبەست لە : (ما لم يُحدِثْ) واتە شتێک نەکات دەستنوێژەکەی بەتاڵ بێتەوە ، وە لە (موسلیم) دا هاتووە :

(ئەگەر ئازاری کەس نەدات ، ئەگەر دەستنوێژەکەی بەتاڵ نەبێتەوە) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٤٩) واتە : ئەم پاداشتە مەرجدارە بە : ئازار بە هیچ کەسێک نەگەیەنێت لە مەجلیسەکەیدا و دەستنوێژەکەی بەتاڵ نەبێتەوە .

## سیواک :



سیواک یەکێکە لە سوننەتە رەهاکان کە لە هەموو کاتێکدا ئەنجام دەدرێت ، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر هانی داوین تەنانەت لە جێگایەکدا فەرموویەتی : (زۆر باسی سیواکم لەسەرتان کرد) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٨٨) لە فەرموودەی (أنس)ەوە – رەزای خوای لەسەر بێت – وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی فەرموویەتی : (سیواک کردن پاک و خاوێنی دەم و رازیبوونی خوای تێدایە) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧) و نەسائی بە ژمارە (٥) لە فەرموودەی دایکە عائیشەوە – رەزای خوای لەسەر بێت – و الألباني بە (صحيح)ی داناوە (الإرواء ١٠٥/١) .

وە سوننەت بوونی سیواک لە چەند جێگایەکدا دووپاتکراوەتەوە لە پێشدا باسی هەندێکی کرا کە لە شەو و رۆژدا دووبارە دەبێتەوە ، وەکو هەستان لە شەودا و لە کاتی دەستنوێژدا و لە کاتی هەموو نوێژێکدا و لە کاتی چوونە ماڵەوەدا - والله أعلم- .

## نوێکردنەوەی دەستنوێژ بۆ هەموو نوێژێک .



سوننەتە موسڵمان دەستنوێژەکەی تازە بکاتەوە بۆ هەموو نوێژێک ، بۆ نمونە ئەگەر دەستنوێژی شوشت بۆ نوێژی مەغریب و ئەمجار نوێژی مەغریب کرد ، جا ئەگەر کاتی نوێژی عیشا هات ئەوا سوننەتە دەستنوێژ بشۆرێت، هەرچەندە دەستنوێژی هەبێت ، جا سوننەتە بۆ هەموو نوێژێک دەستنوێژێکی تازە بشۆرێت .

بەڵگەش لەسەر ئەوە :

فەرموودەیەک کە لە (بوخاری)دا هاتووە دەڵێت : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ هەموو نوێژێک دەستنوێژێکی دەشوشت) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢١٤).

هەروەها سوننەتە مرۆڤ هەردەم دەست بە دەستنوێژ بێت بە درێژایی رۆژەکە ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (ثوبان) – رەزای خوای لەسەر بێت- کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (هیچ کەسێک پارێزگاری لە دەستنوێژ ناکات ئیللا ئیماندار نەبێت) ئەحمەد ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٢٤٣٤) و ابن ماجە بە ژمارە (٢٧٧) و الدارمی بە ژمارە (٦٥٥) وە الألبانی بە صحیح ی داناوە (صحیح الجامع ٢٢٥/١)

## پاڕانەوە :

روونکردنەوەی ئەوەی کەسی موسڵمان ئەنجامی بدات ئەگەر ویستی بپاڕێتەوە ، لەو سوننەتانە :

### أ دوعا بکات لە کاتێکدا دەستنوێژی هەبێت .

بە بەڵگەی فەرموودەکەی (أبو موسى) – رەزای خوای لەسەر بێت – کە لە هەردوو کتێبی (صحیح دا هاتووە ، وە چیرۆکەکەی لە گەڵ (أبوعامر) ی مامیدا – رەزای خوای لەسەر بێت – کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) رەوانەی کرد وەکو بەرپرسی سوپای (أوطاس) ، وە لە فەرموودەکەدا هاتووە: (أبوعامر) – رەزای خوای لەسەر بێت- کوژرا ، وە (ابو موسى)ی راسپارد کە سەلامی بگەیەنێتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و دوعای بۆ بکات ، (ابو موسى) دەڵێت : هەواڵی خۆمان و هەواڵی (أبو عامر)م پێگەیاند و پێم گوت : (ابو عامر) فەرمووی : پێی بڵێ داوای لێخۆشبوونم بۆ بکات ، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای ئاوی کرد و دەستنوێژی پێ شوشت و ئەمجار هەردوو دەستی بەرز کردەوە و فەرمووی : ئەی خودایە لەو بەندەیە (ابو عامر) خۆش بە ) تاوەکو سپێتی بنباڵیم بینی ، ئەمجار فەرمووی : ئەی خودایە لە رۆژی قیامەتدا بەرزی بکەرەوە بە سەر زۆربەی دروستکراوەکانتدا ، یان بە سەر خەڵکیدا ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٣٢٣) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٤٩٨) .

### ب رووکردنە قیبلە :

لە (عبدالله بن عباس)ەوە – رەزای خوایان لەسەر بێت – هاتووە ، دەڵێت : (عومەرەی کوڕی خەتتاب) – رەزای خوای لێبێت- بۆی گێڕامەوە دەڵێت : کاتێ جەنگی بەدر بوو ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەماشای بێباوەڕانی کرد لە کاتێکدا ئەوان هەزار کەس بوون ، وە هاوەڵانی سێ سەد و نۆزدە کەس بوون، پێغەمبەری خوا (ﷺ) رووی لە قیبلە کرد ، ئەمجار دەستەکانی بەرز کردەوە و داوای لە خواکەی دەکرد و دەیفەرموو : ئەی خودایە ئەو بەڵێنەی پێت داوم بیهێنە دی ، ئەی خودایە ئەو بەڵێنەی پێت داوم جێ بەجێی بکە ، ئەی خودایە ئەگەر ئەم کۆمەڵە خەڵکە موسڵمانە لە ناو بەریت چیتر لە زەویدا تۆ ناپەرسترێیت) بەردەوام دەپاڕایەوە و داوای لە خواکەی دەکرد و دەستەکانی بەرز کردبووەو و رووی لە

قیبلە بوو تاوەکو عاباکەی سەر شانی کەوت ، ئەبو بەکر هات بۆ لای و عاباکەی هەڵگرت و خستییە سەر شانی ، ئەمجار توند گرتی و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ).. واز لە داواکردن لە پەروەردگارەکەت بهێنە، دڵنیابە ئەو بەڵێنەی پێی داوی دەیهێنێتە دی ...) (موسلیم) ریوایەتی کردوو بە ژمارە (١٧٦٣)

### ج دەست بەرزکردنەوە.



بەڵگەش لەسەر ئەوە فەرموودەکەی (ابن عباس ی پێشوو – ڕەزای خوایان لەسەر بێت- وە تێیدا هاتووە: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی لە قیبلە کرد ، ئەمجار دەستەکانی بەرز کردەوە) وە فەرموودە بۆ ئەم سوننەتە زۆرن .

### د دەستپێکردن بە ستایشی خوای گەورە و صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ).

بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی (الترمذي) ریوایەتی کردووە لە (فضالة بن عبيد)ەوە – ڕەزای خوای لەسەر بێت – دەفەرموێت : (لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتبوو کابرایەک هاتە ژوورەوە و نوێژی کرد و فەرمووی : ئەی خودایە لێم خۆشبە و بەزەییت پێمدا بێتەوە ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەی کەسی نوێژ خوێن پەلەت کرد ، ئەگەر نوێژت کرد و دانیشتیت ئەوا حەمد و سەنای خوا بکە بەوەی ئەو شایەنیەتی ، ئەمجار صەڵاوات لەسەر من بدە ، ئەمجار لێی بپاڕێوە) الترمذي ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٤٧٦) وە الألباني بە (صحيح)ی داناوە (صحيح الجامع ١٧٢/١).

### هـ داواکردن لە خوای گەورە بە ناوە پیرۆزەکانی.

جا ئەو ناوە پیرۆزانەی خوا هەڵدەبژێرێ کە لە گەڵ دوعاکەیدا بگونجێ و ڕێک بکەوێت ، جا ئەگەر داوای ڕزقی لە خوا کرد ئەوا دەڵێت : یا رزاق ، وە ئەگەر داوای ڕەحمەت ومیهرەبانی لە خوا کرد دەڵێت : یا رحمن یا رحيم ، وە ئەگەر داوای عیززەتی لێکرد ئەوا دەڵێت : یا عزيز ، وە ئەگەر داوای لێخۆشبوونی کرد ئەوا دەڵێت : یا غفور ، وە ئەگەر داوای شیفا و چارەسەری کرد ئەوا دەڵێت : یا شافي .

ئا بەم شێوە بە گوێرەی داواکەی داوا دەکات ، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت : ﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَا ﴾ [الأعراف:١٨٠]. واتە : ناوەکانی خوا هەموو جوان و پڕشکۆن دەسا ئێوەیش هەر بەو ناوانەوە بانگی بکەن، لاڵەو نزاو داوا هەر بەوانە بکەن) .

### و دووبارەکردنەوەی دوعا و پێداگرتن لەسەری.

بەڵگەش لەسەر ئەوە فەرموودەکەی (ابن عباس)ە – ڕەزای خوای لێ بێت – کە لە پێشدا باسکرا ، تێیدا هاتووە پیغەمبەری خوا فەرمووی : (ئەی خودایە ئەو بەڵێنەی پێت داوم بیهێنە دی ، ئەی خودایە ئەو بەڵێنەی پێت داوم جێ بەجێی بکە) بەردەوام دەپاڕایەوە و داوای لە خواکەی دەکرد تاوەکو عاباکەی سەر شانی کەوت ، ئەبو بەکر توند گرتی و فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) .. واز لە داواکردن لە پەروەردگارەکەت بهێنە...)) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٧٦٣) .

هەروەها ئەوەی لە هەردوو کتێبی (صحیح)دا هاتووە ، لە فەرموودەکەی أبو هريرة کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعای بۆ عەشیرەتی (دەوس) کرد ، فەرمووی : (ئەی خودایە هیدایەتی (دەوس) بدە – با موسڵمان بن - و بیانهێنە بۆ ئێرە ، ئەی خودایە هیدایەتی (دەوس) بدە – با موسڵمان بن - و بیانهێنە بۆ ئێرە ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٩٣٧) و (موسلیم) بە ژمارە (٢٥٢٤) .

هەروەها ئەوەی لە (صحیح مسلم)دا هاتووە ، دەربارەی : (ئەمجار باسی کابرایەکی کرد کە سەفەرەکەی درێژ دەکاتەوە و قژگڤ و تۆزاوی یە ، دەستی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان پەروەردگارا... پەروەردگارا ....) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (١٠١٥) وە ئەم دووبارە کردنەوەیە پێداگرتنی تێدا بە دی دەکرێت .

سوننەت وایە سێ جار بپاڕێتەوە ، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (ابن مسعود) – رەزای خوای لەسەر بێت – کە لە هەردوو کتێبی (صحیح) دا هاتووە ، وە تێیدا هاتووە : (وە ئەگەر دوعای بکردایە ئەوا سێ جار دوعای دەکرد ، وە ئەگەر داوای بکردایە سێ جار داوای دەکرد ، ئەمجار فەرمووی : ئەی خودایە .. قورەیش بە هەلاکەتدا بەرە) سێ جار) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٤٠) و(موسلیم) بە ژمارە (١٧٩٤) .

### ز) شاردنەوەی دوعاکە .

بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت : ﴿ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةً ﴾ [الأعراف:٥٥] واتە : دەسا بەسەر کزیی و بە پەنامەکیی ، لە پەروەردگارتان بلاڵێنەوە).

وە شاردنەوەی پاڕانەوە نزیکترە لە ئیخلاصەوە ، بۆیە خوای گەورە مەدحی زەکریای کرد و فەرمووی: ﴿ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيّٗا ﴾ [مريم:٣] واتە : ئەو دەمەکە زۆر بەهێواش و لەسەر خۆو زۆر بە وێڵ و بەئەدەبەوە لەمیحرابەکەی خۆیدا هاناوهاواری لەپەروەردگاری خۆیکرد بەدەنگێکی نزم ونەوی، تاخزم و کەس وکاری نەزانن و، پێش هەموو شتێکیش خوا حەزی لەئارامیی و لەسەرخۆیە) .

وەکو ویستنی ئیخلاص لەسەر یەکێ لە بۆچوونی پێشەوایانی راڤەکار



سوود بە دەست هاتوویەک : رەنگە هەندێ کەس پرسیار بکات : لە دوعاکانمدا چی بڵێم ؟

وەڵام : بپارێوە لەوەی دەتەوێت لە کاروباری دونیا و دوارۆژ ، وە سووربە لە سەر ئەوەی لە دوعاکانتدا (کۆکەرەوەی وشەکان ) بەکار بهێنی ، ئەویش ئەو دوعایانەن کە قورئان و فەرموودەدا هاتوون ، چونکە دوعای خەیری دونیا و قیامەتی تێدایە ، وە جوان وردبەرەوە کاتێ ئەم پرسیارە ئاراستەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرا ئەویش بە چەند وشەیەکی

مەزن و گەورە وەڵامی دایەوە ، کە دونیا و قیامەت بۆ کەسی موسڵمان کۆ دەکاتەوە ، ئا ئەوە چی موژدەیەکی گەورەیە! وە چەند بەخشندەییەکی فراوانە ، بۆیە دەستی پێوە بگرە و لێی تێبگە .

لە (أبو مالك الأشجعی) یەوە هاتووە لە (باوکی)یەوە – رەزای خوایان لێ بێت- (گوێی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو -لە کاتێکدا کابرایەک هات بۆ لای- فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی بڵێم لە کاتێکدا داوا لە پەروەردگارەکەم دەکەم ؟ فەرمووی : بڵێ : ئەی خودایە لێم خۆشبە و بەزەییت پێمدا بێتەوە و سەلامەتم بکە و ریزق و رۆزیم بدە) پەنجەکانی لە یەک نا تەنها پەنجە گەورە نەبێت- واتە : تەنها چوار دوعا بوو- ( ئا ئەو دوعایانە دونیا و دوارۆژت بۆ کۆدەکاتەوە ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٦٩٧).

وە لە ریوایەتێکی تردا هەر لە ئەوەوە هاتووە : (ئەگەر کەسێک موسڵمان بوایە ئەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فێری نوێژ دەکرد و ئەمجار فەرمانی پێدەکرد ئەم وشانە بڵێت : ئەی خودایە لێم خۆشبە و بەزەییت پێمدا بێتەوە و هیدایەتم بدە و سەلامەتم بکە و ریزق و رۆزیم بدە ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٦٩٧) .



◆ چەندە پێویستت بەوەیە لە گەڵ نەفسی خۆتدا دوو بە دوو ببیتەوە و لێپرسینەوەی لە گەڵدا بکەیت ، وە زیکری خواکەی خۆت بکەیت بە تایبەتی لە رۆژگارێکدا سەرقاڵی و بێئاگابوون زۆر بووە.

### سوود بە دەست هاتوویەکی تر :

سوننەتە کەسی موسڵمان دوعا بۆ براکەی بکات بە بێ ئامادە بوونی خۆی (لە پشتە ملە) ، چونکە ئەو دوعایە وەڵام دەدرێتەوە بە ئیزنی خوای گەورە ، وە ئەو کەسەی دوعاکە دەکات فەزڵێکی گەورەی دەست دەکەوێت ، ئەویش ئەوەیە کە (موسلیم) لە (صحیح)ەکەیدا ریوایەتی کردووە لە (أبو درداء) ەوە – رەزای خوای لەسەر بێت- دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (دوعای هەر کەسێک بۆ براکەی لە پشتەملە وەڵام دەدرێتەوە ، لە سەر سەری فریشتەیەک هەیە راسپێردراوە هەرکاتێک دوعای خەیر بۆ براکەی خۆی بکات ئەوا فریشتە راسپێردراوەکە دەڵێت : (امین) وە هەروەکو ئەوە بۆ تۆیش) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٧٣٣) .

### وە لە سوننەتەکانی رۆژانە زیکری خوای گەورەیە :

وە مەزنترینیان : خوێندنەوەی قورئانە ، جا خواپەرستی کردن بە خوێندنەوەی قورئان وای لەسەلەف کردووە کە شەوان نەخەون ، لە جێگەی خۆیان تاری کردوون ﴿ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ۝١٧ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ۝١٨ ﴾ [الذاريات: ١٨ ]. واتە : کەمێک لەشەو ئەخەوتن، زۆربەی شەو نوێژیان ئەکرد(١٧) هێمان لەبەرەبەیاندا، لەخوا داوای خۆشبوون دەکەن، وەک ئەوە کە شەو هەر خەریکی گوناح و تاوان بووبن!(١٨) .

جا لە شەوەکەیاندا خوێندنەوەی قورئان و ئەودوای زیکرەکان کە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) هاتووە کۆ کردووەتەوە ، موژدە بۆ خۆی چی شەوێکە کە ئەهلەکەی هەڵدەستن و زیندووی دەکەنەوە، ئای چەند ئێمە خەسارەتمەند و کەمتەرخەمین و شەوان و کاتی سەحەر بە کەم دەزانین ! وە بەڵکو لە سەرپێچی خودامان رزگار بین ، ئیللا مەگەر کەسێک خوا رەحمی پێکردبێت .

لە (حماد بن زید) ەوە هاتووە ئەویش لە (عطاء بن السائب)ەوە کەوا (أبو عبدالرحمن) فەرموویەتی : (ئەم قورئانەمان وەرگرت لە کەسانێکەوە هەواڵیان پێداین کەوا ئەگەر فێری دە ئایەت بوایەن ، ئەوا لێی تێنەدەپەڕین بۆ دە ئایەتی تر تاوەکو نەزانن چی تێدایە ، بۆیە فێری قورئان و کارکردن پێی دەبوین ، وە ئەم قورئانە لە پاش ئێمە دەبێتە میراتی کەسانێک دەیخۆنەوە هەروەکو چۆن ئاو دەخۆنەوە لە گەروویان تێناپەڕێت) تەماشای : سير أعلام النبلاء بکە (٢٦٩/٤) .

### زیکرکردن ژیانەوەی دڵەکانی تێدایە :



زۆرێک لە ئێمە بە تایبەتی لەم سەردەمەدا ، زۆری مەشغەڵەتی بووەتە هۆی ژەنگی دڵی و بێئاگایی ، وە ژیانەوەی دڵەکان بە زیکر دەبێت ، لە (صحيح البخاری) دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو موسی) وە – رەزای خوای لەسەر بێت- دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (نموونەی ئەو کەسەی یادی خوا دەکات و ئەوەی یادی

ناکات وەکو زیندوو و مردوو وایە) وە لە لەفزەکەی (موسلیم) دا هاتووە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (نموونەی ئەو ماڵەی یادی خوای تێدا دەکرێت و ئەو ماڵەی یادی خوای تێدا ناکرێت وەکو زیندوو و مردوو وایە) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٤٠٧) و (موسلیم) بە ژمارە (٧٧٩) .

خوای گەورە لە زۆر جێگادا هانی داوین بۆ زیکرکردنی ، لەوانە :

١. خوای گەورە هانی بەندەکانی داوە زیکری خوا زۆر بکەن ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ ﴾ [الأحزاب:٤١-٤٢]. واتە : ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە! یادی خوا بکەن یادێکی زۆر، واتە: بێ حەدو سنور یادی خوا بکەن(٤١) وە هەموو بەیانی و ئێوارەیەک خوا بەپاک و خاوێن رابگرن و هەردەم (سبحان الله) بڵێن(٤٢).

٢. خوای گەورە بەڵێنی بەو ژن و پیاوانە داوە کە زیکری خوا دەکەن بە لێخۆشبوون و پاداشتێکی زۆر ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴾ [الأحزاب : ٣٥ ]. واتە : ئەو پیاوو ژنانەی کە زۆر یادی خوا ئەکەن، خوا لێبوردن و پاداشتێکی زۆر مەزن و گەورەی بۆ ئامادەکردون).

٣. خوای گەورە ئاگاداری کردینەوە لە رەوشتی دووڕووەکان ، جا ئەوان زیکری خوا دەکەن، بەڵام وردبەرەوە ئەندازەی زیکرەکەیان چەندە ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَـٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓا۟ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُوا۟ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ [النِّساء :١٤٢].واتە : بێگومان دووڕووە دەغەڵەکان بەخەیاڵی خاویان دەیانەوێ فێڵ لەخوا بکەن و بیخەڵەتێنن! ئەو برە ملکەچی و بەرفەرمانەشیان هەر بۆ ئەوەیە، بەڵام خوا خەڵەتێنەرو تەفرەدەری ئەوانە، فروفێڵەکانیان زۆر بە ئاسانی پووچەڵ دەکاتەوەو سەرناگرن ، هەرکە دەچن بۆ نوێژ کردنیش دەبینی بە تەوەزەلی راست ئەبنەوە و هەڵدەسن، چونکە بەتەمای پاداشت و خۆشنوودی خوا نین، لەبەرامبەر خەڵکدا رووپامایی دەکەن و بۆ رووبینی نوێژ ئەکەن! تا پێیان نەڵێن کافرن ، زۆر کەمیشیان یادی خوا دەکەن).

٤. وە خوای گەورە وریای کردینەوە کە سامان و منداڵ سەرقاڵمان بکەن لە زیکری خوا ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَـٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴾ [المنافقون: ٩]. واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ماڵ و منداڵتان لەیادی خوا غافڵتان نەکەن، هەرکەسێک کاری وابکات! ئەوانەن زیانمەن و دۆڕاو ، چونکە فەزڵ و باوی دونیایان بەسەر پاشەڕۆژدا داوە.)

٥ وردبەرەوە لە گەڵ مندا لەم فەزڵە مەزن و شەرەفە بەرزە ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ ﴾ واتە : دەسا ئێوە ئەی موسڵمانان! یادی من بکەن، تا منیش یادی ئێوە بکەم، پاداشتان بە چاکە بدەمەوە) .

وە لە فەرموودەیەکی قودسیدا فەرموویەتی : (من بە گوێرەی گومانی بەندەکەمم بەرانبەر بە من ، وە من لە گەڵیدام ئەگەر یادم بکاتەوە ، جا ئەگەر لە نەفسی خۆیدا یادم بکات ئەوا منیش لە نەفسی خۆمدا یادی دەکەم ، وە ئەگەر لە نێو کۆمەڵێکدا یادم بکات ئەوا من لە ناو کۆمەڵێکدا یادی دەکەمەوە کە لەوانە چاکتر و باشترن) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٧٤٠٥) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٦٧٥) لە فەرموودەی (أبو هريره) وە – ڕەزای خوای لەسەر بێت-. ،

## وە ئەوەی لە سوننەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە لە جۆرەکانی زیکر زۆرن ، لەوانە :

١ لە (أبو هريره) وە هاتووە – ڕەزای خوای لێ بێت – کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ بڵێت : هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت، تەنها و بێ هاوەڵە، موڵک و سوپاس و ستایش تەنها بۆ ئەوە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە) هەر کەسێک لە ڕۆژێکدا سەد جار بیڵێت ئەوا (خەیر و چاکەی) بە ئەندازەی ئەوەیە دە کۆیلەی ئازاد کردبێت و سەد چاکەی بۆ دەنوسرێت و سەد خراپەی دەسڕێتەوەو لەو ڕۆژەدا پارێزراو دەبێت لە شەیتان تاکو ئێوارەی بەسەردا دێت وە لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ کەسێک لە ئەو باشتری پێ نییە (یان لەو باشتری نەهێناوە) ئیللا کەسێک لەو زیاتری وتبێت. وە هەرکەسێک لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵێت : (سبحان الله وبحمده) ئەوا تاوانەکانی هەڵدەوەرێت هەرچەندە بە ئەندازەی کەفی سەر دەریا بێت )) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٢٩٣) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٦٩١) .

٢ لە (أبو أيوب) ەوە هاتووە – ڕەزای خوای لەسەر بێت- پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێک بڵێت : (هیچ پەرستراوێک نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت ، تەنها و بێ هاوەڵە ، موڵک و سوپاس و ستایش تەنها بۆ ئەوە و توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە) دە جار ، ئەوا وەکو ئەوەیە چوار نەفسی لە کوڕەکانی ئیسماعیلی ئازاد کردبێت) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٤٠٤) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٦٩٣) .

٣ وە لە (سعد بن أبي وقاص) ەوە هاتووە – ڕەزای خوای لەسەر بێت- دەڵێت : (لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووین ، فەرمووی : ئایە هەر یەکێکان ناتوانێت لە هەموو ڕۆژێکدا هەزار حەسەنەی دەست بکەوێت ؟ یەکێک لە دانیشتوانی پرسیاری کرد و وتی : چۆن یەکێک لە ئێمە هەزار حەسەنەی دەست دەکەوێت ؟ فەرمووی : سەد تەسبیحە بکات (واتە : بڵێت: سبحان الله) ئەوا هەزار حەسەنەی بۆ دەنوسرێت یان هەزار گوناهی لەسەر دەسڕێتەوە) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٦٩٨)

٤ لە (أبو هريرة) وە هاتووە – رەزای خوای لەسەر بێت- کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (هەرکەسێک لە رۆژێکدا سەد جار بڵێت : (سبحان الله و بحمده) ئەوا تاوانەکانی هەڵدەوەرێت هەرچەندە بە ئەندازەی کەفی سەر دەریا بێت ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٤٠٥) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٦٩٢) وە لە ریوایەتێکی تردا لە (موسلیم) دا هاتووە : (هەر کەسێک کاتێ رۆژدەکاتەو و کاتێک رۆژی بە سەردا ئاوا دەبێت سەد جار بڵێت : (سبحان الله وبحمده) واتە: پاکی و بێگەردی بۆ خوا و سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەو) ئەوا هیچ کەسێک لە رۆژی قیامەتدا نایەت لە ئەو باشتری هێنا بێت ، ئیللا کەسێک نەبێت وەکو ئەوی وتبێت یان لەو زیاتری وتبێت) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٦٩٢) .

وە ئەو فەرموودانەی لەسەر جۆرەکانی زیکر و فەزڵی هاتوون زۆرن ، وە ئەوەی باسکرا لە بەناوبانگترین و راستترینیانە لەسەر فەزڵی زیکر هاتوون ، وە هی تریش هاتووە و زۆرن، لە (أبو موسى الأشعري) یەوە هاتووە –رەزای خوای لەسەر بێت- دەڵێت : پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی وتم : ئایا گەنجینەیەکت لە گەنجینەکانی بەهەشتت نیشان بدەم ؟ وتم : بەڵێ، ئەویش فەرمووی : ( لا حول ولا قوة إلا بالله) یە ) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٤٢٠٢) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٧٠٤) .

لە (أبو هريره ) وە – رەزای خوای لەسەر بێت- هاتووە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر بڵێم : (سُبْحَانَ اللهِ ، وَالْحَمْدُ للهِ ، وَلَا إِلَـهَ إِلَا اللهُ ، وَاللهُ أَكْبَرُ) پێم خۆشترەو لە هەموو ئەوەی رۆژی بە سەردا هەڵاتووە ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٦٩٥) .

هەروەها داوای لێخۆشبوون (الأستغفار) یەکێکە لە جۆرکانی زیکر ، لە (الأغر المزني)یەوە هاتووە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (دەڵێی تەمێک دەدرێـتە سەر دڵمدا ، بۆیە من لە رۆژێکدا سەد جار داوای لێخۆشبوون دەکەم ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٧٠٢) .

ئەمەش کرداری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووە ، وە لە فەرموودەکانیدا هانی داوین داوای لێخۆشبوونی لێ بکەین، هەروەکو لە (صحيح مسلم) هاتووە بە هەمان شێوە لە (الأغرَ)ەوە – رەزای خوای لێ بێت – فەرموویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەی خەڵکینە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ، من لە رۆژێکدا سەد جار تەوبە دەکەم ) (موسلیم) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٢٧٠٢) .

لە (بوخاری)دا هاتووە لە فەرموودەی (أبو هريرة) وە – رەزای خوای لێ بێت – دەفەرموێت : گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو : (سوێند بە خوا من داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم و تەوبەی لادەکەم لە رۆژێکدا زیاتر لە حەفتا جار) (بوخاری) ریوایەتی کردووە بە ژمارە (٦٣٠٧) بۆیە پێویستە بەندە بێ ئاگا نەبێت لە داوای لێخۆشبوون کردن.

سوننەتی زیكر – هەروەها هەموو سوننەتەكانی رۆژانە – كۆتایی پێدەهێنم لە زیكرێكی مەزن كە لە هەردوو (صحیح)دا هاتوون ، ئەویش فەرموودەكەی (أبو هریرة) یە – رەزای خوای لێ بێت – فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (دوو وشە هەن ، سووكن لەسەر زمان ، قورس و سەنگینن لە سەر تەرازوو ، خۆشەویستن لای خوای میهرەبان كە ئەوانیش بریتین لە : : سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظیم )) (بوخاری) ریوایەتی كردووە بە ژمارە (٦٤٠٦) و(موسلیم) بە ژمارە (٢٦٩٤) .



Kurdish



# سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و زیکرەکانی ڕۆژانەی



اللغة الكردية
KURDISH LANGUAGE



جميع لغات المشروع
ALL LANGUAGES